

کورتەیەك لە

# بنەماکانی لێکۆڵینەوەی تاوانکاری

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com


ئامادەکردنی: لێکۆڵەری دادی

د. شاکرسلێمان محمود

وانەبێژ لە زانکۆی سۆران





چاپی یەکەم ٢٠٢٣

# کورتەیەک لە بنەماکانی لێکۆڵینەوەی تاوانکاری

ئامادەکردنی: د. شاکر سلێمان محمود/ وانەبێژ لە زانکۆی سۆران
نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣
چاپکردن: چاپخانەی هێڤی
تیراژ: ٥٠٠ دانە

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارەی سپاردنی (٣٢٥)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.**

---



---




**لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (تەبایی)**
**بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی پەرتوکی یاسایی**
**ژمارەی مۆبایل : ٠٧٥٠٧٠٢٦٠٢١**

# کورتەیەک لە

# بنەماکانی لێکۆڵینەوەی تاوانکاری


**ئامادەکردنی**

**د. شاکر سلێمان محمود**

**وانەبێژ لە زانکۆی سۆران**


**٢٠٢٣**

# پێشەکی

جێبەجێکردنی یاسا هۆکارێکە بۆ ڕێکخستنی کاروباری ڕۆژانەی هاووڵاتییان لەناو کایەی دەوڵەت، لە پێناو هاتنەدی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پاراستنی گیان و سەروەت و سامانی هاووڵاتییان و پاراستنی دابونەریت و ئادابی گشتیی و بەها ڕەوشتییەکانی کۆمەڵگە، یاسای سزاکان دەورێکی کاریگەر دەگێڕن و هۆکارێکن بۆ ڕێگرتن لە ئەنجامدانی تاوان وە سزای بۆ هەموو ئەو تاوانبارانە داناوە کە پێشێلی یاسا دەکەن و دەبنە هۆیەک بۆ پێشێلنەکردنی مافی هاووڵاتییان، لە پاڵ ئەمانە یاسا هەموو ڕێوشوێنی کارکردنی لێکۆڵەر بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوان ڕێکخراوە بەپێی یاساو هەموو پێداویستی ماددی و مەعنەوی ماددەی یاسایی دیاریکردووە و لێکۆڵەر بەپێی یاسا هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆمەتباران و تاوان لێکراوان و ئاشکراکردنی هەموو ئەو هۆکارانەی کە پاڵنەرن بۆ تاوانەکە و دۆزینەوەی تاوانباران و ڕەوانەکردنیان بۆ دادگای تایبەتمەند بە مەبەستی دادگاییکردنیان و سزادانیان لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگا لەهەموو بوارەکانی ژیان و پەیدابوونی شێوازی نوێی تاوان لە لایەن تاوانبارانەوە هۆکار و شێوازی نوێی لێکۆڵینەوەش پەیدا بووە، لە سەرەتا تاوان بە شێوازی سادە ئەنجامدەدراو ئێستا بە شێوازی ئاڵۆز و بەرنامەدارێژراو بە تەکنیک و تەکنەلۆژیای سەردەم بە ستراوەتەوە، لەبەر ئەوە ئەرکی لێکۆڵەر قورس بووە و کۆمەڵێک ڕێکاری زۆر هەیە دەیگرێتە بەر بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکانی تاوان و پەردە لادان لەسەر لایەنە شاراوەکانی تاوان و پاڵنەرەکانی و ئاشکراکردنی تاوانباران، ئەمەش لە لێکۆڵەر پێویست دەکات هەموو کات لە ڕاهێنان و فێربوونی

بەردەوام و جوڵە و کارکردنی بێ ماندبوون و شێوازی زانستی نوێی هەبێت، تا بتوانێ لە ئاست کارەکەی سەرکەوتوو بێت بەسەر تاوانباران پێویستی بە خولی تایبەت بە ڕاهێنانی وردی لە کار و ئەزموونی زۆر و باوەڕ بە خۆبوونی لێکۆڵەر لە چوارچێوەی کاری بە گروپ فاکتەری ئاشکراکردنی تاوان و تاوانبارانە، تاوان هەیە لێکۆڵینەوە تێیدا زۆر ئاڵۆزە، ئەوەش بەهۆی ئەوەی هەندێ تاوانباری خاوەن ئەزموون لە تاوانکردن، هەموو شوێنەوارێکی تاوانکاری دوای خۆیان ڕەشدەکەنەوە و بەڵگەکان دەشارنەوە یان لەناوی دەبەن، ئەو جۆرە تاوانبارانە خاوەن پێشینەن و دەزانن چۆن لە شانۆی تاوان بەڵگەکان بەجێنەهێڵن و ئەو تاوانبارانە هەرچەندە خاوەن ئەزموون بن، لە بەرامبەردا لێکۆڵەری بە ئەزموونیش هەیە بە بێگومان ئاشکرایان دەکەن، ئەو لێکۆڵەرەوانە خاوەن ئەزموونی زۆرن لە کاری لێکۆڵینەوە و شارەزای شێوازی تاوانی تاوانباران و دەزانن تاوانبار چۆن بەڵگەکان دەشارێتەوە و چی لێدەکات ئەم خوێندنەوە دروستەی لێکۆڵەر هۆکار دەبێت بۆ ئاشکراکردنی تاوانەکە و تاوانباران تاکو بە سزای یاسایی خۆیان بگەن.

قۆناغی لێکۆڵینەوە لە تاوان بۆ پشکنین و کۆکردنەوەی بەڵگەکانی تاوان قۆناغێکی زۆر گرنگە لێکۆڵەر دەتوانێ لەم قۆناغە ببێتە هۆکاری ئاشکراکردنی تاوانباران، کاری لێکۆڵەر ورد و مەترسیدار و سەختە و خێرایی و دەستوبردی پێویستە بۆ کارکردنی لە شوێنی ڕووداني تاوانەکە کە پێی دەڵێن شانۆی تاوان، لێکۆڵەر هەموو هەوڵێکی دەخاتە گەڕ و سەرجەم ڕێکارە یاساییەکان ئەنجامدەدات، لە پێنا و ئاشکراکردنی تاوانباران و هەڵگرتنەوەی بەڵگەکان کە هۆکارن بۆ ناساندنی تاوانبار کە تاوانەکەی ئەنجامداوە و، بەهۆی ئەم بەڵگانەوە دەسەلمێندرێ کە تاوانبار بەهۆی نیەتی تاوانی لەسەر تاوانلێکراو تاوانی کردووە و مافی پێشێلکردووە، لە بەرامبەردا یاسای پێشێلکردووە و ئەم کارەی بەپێی یاسا قەدەغەکراوە و بەهۆی لادانی لە یاسای سزا بدرێت.

ئەم بابەتە تایبەتە بە قوتابیانی بەشی یاساو هەموو لێکۆڵەرەوە بەتوانا و لێهاتووەکان و ئەوانەی تازە دەست بە کاری لێکۆڵینەوە دەکەن، تاوەکو بەهەموو لایەکمان وڵاتەکەمان لە تاوان و تاوانباران بپارێزین ئەو ئەرکە یاسا پێی سپاردین هەر بە یاسا جێبەجێ بکەین، گیان و ماڵی هاووڵاتیانی سڤیل بپارێزین و ئاسایش لە وڵاتەکەمان بەهەموو لایەک بچەسپێنن، هەر بە یاسا دەتوانین ئەم کارە بکەین وببینە رێگری سەر سەخت لەبەردەم کرداری تاوانی تاوانباران و بۆ ئاشکراکردن و سزا گەیاندنیان لە پێناو سەروەری یاسا.

# سکاڵا

## ١- بژاردەکانی سکاڵاکار لە بەرەنگاربوونەوەی تاوان

چاکەو ئاشتی لـە دەروونـی مرۆڤدا، بنجی و بنەڕەتییەو خراپەو دەستدرێژی نـوێکردە، دەبینیـت زۆربـەی خـەڵك هـەوڵ دەدەن لـە گیرورگرفـت و نـاکۆکی دوورکەونەوە، سەرباری خەریك بوونیان بە وردەکاریی ژیانی ڕۆژانەیان و گرنگی دان بە لایەنە دارایی و کۆمەڵایەتییان.

بەگشتی ژیانی سروشتی هێمن و ئاسوودە، خۆزایی (فطري) گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆیـی ئاشـتی ئـامێز، ئەمـە بنجـی هەڵوێسـتەکانە، هـەڵاواردە، ئـەوە نووکردەیە بەگوێرەی هەموو گشتییەکان، لەوەشدا بارودۆخی ژیـان دەشـێ وێنـەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاسایی ناکاو بگۆڕێت، بەجۆرێك کەس چاوەڕوانی نەدەکردبێت، هێمن و سەقامگیری بگۆڕێت بۆ دەستدرێژی و ترس و خۆشی ببێتە ناخۆشی، لە ترووکەیـەکی ڕۆژگـاردا خـۆت و بنەماڵـەت ببینیـت ڕووبـەڕووی دەسـتدرێژیی ئاشکرابووبێتەوە، زیانی ماددی یا جەستەیی لەتۆ بدات، ئایا چارە چییە؟

بەداخەوە هەندێ تـاکی کۆمەڵگـە لـە بارودۆخی تاوانـدا ژیـاون، دەشـێ هەنـدێ خۆشەویستانیان لەدەست دابێت، لـە خزم و نزیکانیـان چـی بـە تـاوانی کوشـتن یـا ڕفانـدن، یـا دووچـاری تـاوانی دزی یـا فێـڵ هـاتبن و زیـانی مـاددی گـەورەیان بەرکەوتبێت و تا ماوەیەکی زۆر ئینجا بەسەر شوێنەوارەکانی زاڵ بووبن.

تاوانەکان زیانی ماددی گەورە لە تاوانلێکراو دەدەن گەر سامانی گرتەوە، دەشێ تاوانلێکراو بە بەخت بێت و بتوانێت بەسەر ئەم زیانانە زاڵ بێت.

زیانی گەورەی ڕاست ناکرێتەوە ئەوەیە، گەر تاوان ژیانی مرۆڤێکی کردە ئامانج و لەناوی برد، یا بەشێکی تەنی مرۆڤ بگرێتەوەو ئەندامێکی تا هەتایە لە دەست

بدات، یا تاوان بەرانبەر ئابڕوو و شکۆی مرۆڤ بکرێت، ئەوە یان بە ئاسانی چاك ناکرێتەوە، تاوانەکان لە ڕاستیدا ئازارو پەژارە پەیدا دەکەن.

**لە شێوەکانی تاوان ئەمانەن:**

- ئۆتۆمۆبێل دەهاژۆی وماڵباتت لەگەڵە، کەسێك ڕووبەڕووت دەبێتەوەو جوێنت پێ دەدات، یا پێڵاوت لێ بەرز دەکاتەوە دەیەوێت لێت بدات، یا تفت لێدەکات، کاردانەوەت چی دەبێت؟
- کلیلی ماڵەوەت دەدەیتە کارەباچی تا دەزگا کارەباییەکانت بۆ چاك بکاتەوە، کارەباچییەکە دانەیێکی دیکە لەسەر کلیلەکەت دروست دەکات و کاتێکی دیکە دێت، کەوا خۆت و ماڵەوەت لە گەشت دا بن، دزی لە ماڵەکەت دەکات، هەموو ماڵت دەدزێت، گیروگرفت لەوەدایە تۆ هاوسێت تۆمەتبار دەکەیت، برای خێزانتە، بێ ئەوەی بزانیت دزەکە هەر ئەو کارەباچییە بوو کە کلیلت پێدا، ئایا چی دەکەیت؟
- لەوە دڵنیا دەبیتەوە، خێزانت- ژنەکەت، دوای بیست ساڵ هاوسەری، پێنج منداڵت هەیە، ناپاکیت لێ دەکات لەگەڵ ئەو شوفێرەی تەکسییەی دەیباتە دەوام، لەو بچووکترە بە بیست ساڵ و لە بازاڕی پیاواندا نیو دینار ناکات! چی دەکەیت؟ کوشتن؟ یا سکاڵا؟ یا ئابڕووچوون؟ یا بێدەنگ بوون؟
- دوای ئەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەت دەفرۆشی و ڕادەستی کڕیاری دەکەیت، چەکێك- شیك (صك) وەردەگریت لە بڕی پارەکەو دەچیتە بانك بۆ وەرگرتنی پارەکە، دەبینیت خاوەن چەك پشتێنە- رصیدی دارایی نییەو هەژمارەکەی پارەی تیا نییە، چی دەکەیت؟
- لەکاتێکی ئاساییدا، لە ڕۆژێك لە ڕۆژان، سەیری مۆبایلی خۆت دەکەیت دەبینیت ماڵپەڕێك- موقع الکترونی، وێنەیێکی ساختەی گۆڕدراوی خێزان و بنەماڵەتی بڵاوکردۆتەوە لە حاڵەتێکی ئابڕووچووندا و بە ڕووتی، ئەوەیش

لەلایەن کەسێك کراوە هاندەری دوژمنایەتی بووەو ناکۆکی لەگەڵ تۆ، ئەو لەخوانەترسە، بێغیرەت و بێناموسە! وایکردووە، ئایا هەست بەچی دەکەیت؟ چی دەکەیت؟

- منداڵێکی زۆر خۆشەویستت دێت و دەگرییێت و پێت دەڵێت خاوەن بازارگەی سەری جادەی، دەستدرێژی سێکسی کردۆتەسەری و جلوبەرگی دڕاندووەو هەڕەشەی لێکردووە گەر ناوی بێنێت دەیکوژێت؟ چی دەکەیت؟
- مێردی کچەکەت لە ئەنجامی ناکۆکی لەگەڵ کچەکەت و نەدانی بژێوی-(نفقة)ی منداڵان و داواکاری تەلاق- جیابوونەوە، دێت و ئۆتۆمۆبێلەکەت کە لەبەر دەرگایە درەنگانی شەوی دەسووتێنێت!!
- دەچیت بۆ بازاڕو دۆلار دەکڕیت بە مەرجی دانەوەی بە دیناری عێراقی و لە ماوەیەکی دیاریکراوداو کۆی پارەکە بە دیناری عێراقی دەکاتە سەدو پەنجا ملیۆن، بەرە بەرە پارەکە دەدەیتەوە، دواتر ناتوانیت قیستەکانت بدەیتەوە، ناچار دەبیت ئۆتۆمۆبێلت بفرۆشیت و بەشێك لە سوود (فائدة)ی سەر پارەکە بدەیتەوە، دواتر پارچە زەوییەکت هەیە دەفرۆشیت و سوودەکانی دەدەیتەوە، دوای سێ ساڵ دیسان سوودەکان (الفوائد)ت لەسەر کەڵەکە دەبن و پارەکە دەکاتە سێ سەدو پەنجا ملیۆن دینار، جگە لەو پارەی داوتە، دەبینیت خراویتە بەندیخانەوە، لەبەرئەوەی چەکێکی بێ پشتیوانە (رصید)ت داوەتە سووکارەکە (المرابی) وەك دەستەبەری، کار چییە؟ چارە چییە؟
- ئەفسەری بنکەی پۆلیس پەیوەندیت پێوە دەکات کچەکەت لە بنکەیە، وەرە وەری بگرەوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ شوفێری تەکسییەك بینراوە لە حاڵەتێکی شەر ماوەرو دەترسێت بگەڕێتەوە ماڵەوە!!
- برای خوێنەر ئایا هەست بە توندی و دڕندەیی دەکەیت؟ ئایا هەست بە ترس دەکەیت؟ ئایا چی دەکەیت گەر لە م هەڵوێستەدا بیت!

- چی دەکەیت گەر داواکاریت بۆهات بۆ چوونە بنکەی پۆلیس، رۆژی پێنجشەم، لە کۆتایی دەوام، تا پەڕاوی لێکۆڵینەوەت نەخرێتە بەردەستی دادوەری لێکۆڵینەوەو لە ڕاگری (توقیف) بمێنیتەوە تا رۆژی یەکشەم، لەکاتی شەو و لەکاتی لێکۆڵینەوەدا دووچاری لێدان و سووکایەتی پێکردن بێیت، تۆی ئازادو ڕێزدارو خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی بەرچاو لەنێو خەڵکدا؟ هەست بەچی دەکەیت! چی دەکەیت؟
- ئایا چی دەکەیت، گەر هەندێ لە ناسیاوانت، کە ناکۆکیت لەگەڵیان هەیە، لەبەردەم دادگا شایەتی بەدرۆیان لەسەر تۆدا، تۆش سەرسوڕماو باوەڕ بەم قسانە ناکەیت کە دەیبیستیت، گوایە برادەرتن!؟
- داوای لێبوردن دەکەم گەر ئێوەم خستبێتە پێگەی ئازاری سکاڵاکار یا زیان دیدە دووچاری دەبێت، ئامانجم ئەوە بوو بتخەمە بارێکی دەروونی هاوشێوە بۆ ئەوەی بتوانیت بڕیاری دروست بدەیت دوور لە پشێویی تۆڵەسەندنەوەو ئابڕووچوون.

لە رابردوو چەندان شێوەی تاوانم باس کرد رۆژانە بە واقیعی ڕوودەدەن، ئایا پێشبینی دەکەی ڕووبەڕووی ئەم تاوانانە ببیتەوە! ڕەفتارت چۆن دەبێت! باری دەروونی و دارایی و خێزانیت چۆن دەبێت؟ ڕێگا دروستەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم جۆرە تاوانانە چۆنە؟ بەو هەموو زیان و دڕندەییەو خەمەوە.

لە ڕەوتی باری ژیانی رۆژانەوەو لە بینینی ڕەفتاری ڕۆژانەو یاسایی هاووڵاتییان لە دادگاکان بینیومانە، هەروەها لە کۆمەڵگەو لای هاووڵاتیی عێراقی و جێگیریی دابونەریت و باوی کۆمەڵگەیی و بەها ئاکارییەکان (الاخلاقیة) و ئایینییەکان سێ ڕێگامان دۆزیوەتەوە، بەگشتی خەڵك پەیڕەوی دەکەن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تاوانانەی ڕووبەڕووی ئەوان دەبێتەوە، ئەمانەن:

یەکەم: ڕێگای ئاشتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی تاوان.

دووەم: ڕێگای عەشائیری- هۆزگەری لە ڕووبەڕووبوونەوەی تاوان.
سێیەم: سکاڵاکردن لە دادگەو دادوەری لێکۆڵینەوە.

لە خوارەوە بە وردی باسیان دەکەین:

## یەکەم: ڕێگای ئاشتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی تاوان.

ئەوەشیان بێدەنگ بوونەو خۆگرییە لەبەردەم ئازار، لێبووردن و گەردەن ئازادکردنە، بە هاندەری ئایینی و پەروەردەیی و زگماکی- فطري. ئەوەشیان ئاسانترین ڕێگەیەو لە هەمووان بالاترە بۆ کۆمەڵگەو خێراترینە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاسایش و ئاسوودەیی و یەکدیگری.

هاووڵاتی ناچێتەوە بۆ دادگەی لێکۆڵینەوەو سکاڵا ناکات و لە مافە عەشائیرییەکەی وازدێنێت و داوای مافە سزایی و شارستانی و عەشائیرییەکەی ناکات، ئەم ڕێگایە هەرچەندە زۆر لایەنی لەباری هەیە، بەڵام لە هەمانکات لایەنی نەرێنی زۆری تێدایە، لەوانە:

(١) ڕزگاربوونی تاوانبارە بێ باکەکان لە سزا وەرگرتن.

(٢) مافی کۆمەڵگە لە سزادانی تاوانبار لەنێو دەچێت، کە پێویستە بۆ پاراستنی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە تاوان. (٣) لەنێوچوونی مافەکانی سزایی و شارستانی سکاڵاکار.

(٤) سکاڵاکار هەموو زیانەکانی دەکەوێتە سەر کە دەشێ نەتوانێت لە ئەستۆی بگرێت لەوانەش زیانە ماددی و دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان.

(٥) هەستی زۆر لێکراوی و ستەم لێکراوی و چەوسانەوە لای هاووڵاتی زێدە دەبێت، ئەوەشیان هەستی دوژمنداری و بێزەوەری لا دروست دەبێت و کارا نابێت لە کۆمەڵگەدا.

- لە دوارۆژدا وەك بۆمبێکی کات دیارکراوی لێدێت و هاندەری تاوانی دیکە دەبێت.
- بێدەنگ بوون و لێبوردەیی لە تاوانە ترسناکەکان دەشێ کاردانەوەی پێچەوانە دروست بکات لای منداڵەکانت یا براکانت و ئەندامانی هۆز- عەشیرەتەکەت، دەشێ باوەڕیان بە لێوردن نەبێت، کە تۆ هەتەو کاردانەوەیان دەشێ توونددوتیژ بێت و دیارکراو نەبێت و نەگونجێت لەگەڵ هەڵوێستی لێبوردەیی و لێخۆشبوون، دەشێ ببێتە هۆی تاوانێکی دیکە ی دزی وتاوانکاری.
- لێبوردەیی و لێخۆشبوون دەبێتە هۆیەك بۆ یاسا پێشێلکردن و هاندانی تاوانکردنی، بەتایبەتی مەترسیدارەکان، ئەوەشیان جۆرێك پاساو و هیوا دەدات بە تاوانباران لە دەسکەوتنی لێبوردنی کەسی و نەچوونە دادگاو ڕزگاربوون لە سزا، دەبینین هیچ گیروگرفت نییە لە لێبوردن یا وازهێنان لە دەستدرێژییەکانی مەبەستدار نین، لە هەمانکات لێبوردن و لێخۆشبوون لە تاوانبارانی سەرەڕۆ بە باش نازانین و هانی ئەم جۆرە لێخۆشبوونە نادەین.

## دووەم: ڕێبازی هۆزگەری- عەشائیری:

زۆربەی جاران لە نێوان ئەندامانی هۆزەکان دەکرێت، لەو تاوانانەو سەرپێچییانەی بچووکن مەترسیدار نین وەك ڕووداوی هاتوچۆ و شەڕی بچووك و جنێودان و ناوزڕاندن (القذف).

شێوازی چارەکردنی یاسایی گیروگرفتەکان لە ڕێگەی هۆزگەرییەوە (دەستووری هۆزگەری) (السوانی العشائرية).

تیایدا (سکاڵاکار) دەچێتە لای پیری هۆز (شيخ العشيرة) پێش سکاڵاکردن لە دادگەی تایبەتمەند، باسی جۆری دەستدرێژییەکەی بۆ دەکات و ڕادەی زیانەکانی

و ناوی سکاڵاکارو هۆزەکەی، دواتر پیری هۆزەکە، پەیوەندی بە پیری هۆزی تاوانکار دەکات بۆ ئەوەی چارەیەکی گونجاو بدۆزنەوە بەپێی ڕێسای باوی هۆزەکان، هەر کۆمەڵە لە ناوچەی لێك نزیك (دەڤەر) ڕێسایەکی هەیەو کەس سەرپێچی ناکات.

ناکرێ ڕۆڵی هۆزگەری بە کەم بگیرێت و داب و نەریتی هۆزگەری (سواني) لە چارەکردنی گیروگرفتەکان و کەمکردنەوەی ئاژاوەو پاراستنی هێمن و ئاسایش و ئاشتی لە کۆمەڵگەدا، بە درێژایی مێژووی عێراق، ڕێساکان و دابی باوی هۆزگەری شوێنپەنجەی دیارە لە سەپانی ئاشتی لەنێو خەڵکداو کەمکردنەوەی ناکۆکی ئاڵۆزکاری.

هاوکات پشتگیری سیستەمی دادوەری دەکات لە جێبەجێکردنی یاسا بە هەماهەنگی لەگەڵ گێڕانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە نێوان نەیارەکان و هۆزەکانیان و بەردەوامی ژیان و پشتگیری یەکترو نەهێشتنی ناکۆکییەکان و ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەیان.

ئاشتەوایی هۆزگەری (صلح عشائري)یە هەموو وردەکاری و مێژووییەوە خۆی سەپاندووە وەك واقیعێکی کارا بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوان خەڵك، پیرو پیاوماقوڵانی هۆزە عێراقییەکان ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیان هەبوو لە چارەکردنی ناکۆکییەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەو هەتا لە مەترسیدارترین تاوانەکان، هەتا یاساش ناتوانێت یەکجاری چارەی بکات وەك ڕفاندنی ژن و کوشت و زیناو ئابڕوبردن و دەستدرێژیی زایەندی- سێکسی.

ڕێبازی ئاشتەوایی هۆزگەری (صلح عشائري) لە چارەکردنی ناکۆکییەکان چەند تایبەتمەندێکی هەیە، لەوانە:

- تێچووی کەمە (قلة التكاليف).
- خێرا یەکلایی دەکرێتەوە.

- ڕاستەوخۆو خێرا قەرەبوو وەردەگیرێت.
- سارێژکردنی زیانی مەعنەوی و دەروونی لەبەردەم خزم و خێش.
- بەڵێنـدان بـە دووبارەنەبوونـەوەی دەسـتدرێژییەکە لەلایـەن هـەردوولاوە بـە دەستەبەری (کفالة) تاکەکانی کۆمەڵگە ئەوانەی شوێن و پایەیان گرنگە (پیاوماقولان).
- دەشێ ببێتە سەرەتای یەکترناسین و پەیدابوونی دۆستایەتی و برایەتی لە نێوان لایەنە ناکۆکەکان.
- ئەو ناکۆکیانەی لە ڕێگەی دادگاکانەوە داناپۆشرێن، لێرەدا بە داپۆشراوی دەمێننەوە.
- پشتگیری یاساو دادوەری و هاوکاری لە خێرا یەکلایی بوونەوەی داواکان بەتایبەتی ئەوانەی وازهێنان (تنازل)یان تێدایە، یا لێخۆشبوون و بووردن.

هەرچەنـدە چاك کردنـەوەو پێکهێنانـەوەی هۆزگـەری لایـەنی ئـەرێنی زۆرە لـە یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییـەکان لـەنێو تاکەکانی کۆمەڵگـە، بـەڵام لایـەنی نەرێنیی هەیە، لەوانەش:

- کـاراکردنی دابونـەریتی هۆزگـەری (السـواني العشـائرية) زۆرو فـرەن، زیندووکردنەوەیان لەسەر پێشێلکردنی سەقامگیری و هێزی یاسا سزاییەکان دەبێت، کە دەبێ بزانین دابونەریتی هۆزگەرییـەکان یـەکخراو نـین و هێزی جێبەجێکردنیان نییە نەیارەکان (الخصوم) مـافی داوای مافـەکانیان هەیـەو ئازادن، شێوازو دارشتەیێکی پابەندکردنی یاسایی نییە.
- دووانەتیی یاساکان دەبێتە هۆی بێهێزی یاساو ون بوونی شکۆی دادوەری.
- هۆزە گەورەکان باڵادەست ترن لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگەو زۆر ماف پێشێل دەکرێن، بەتایبەتی ئەوەی هۆزێکی گەورەی نییە.

- ونبوونی ئادگارەکانی تاوان لەباری نەگەڕانەوە بۆ دادگاو دادوەری لەکاتی پێویست.
- مافەکانی بیانی و نیشتەجێکان و ئەوانەی هۆزیان نییە ون دەبێت و پێشێل دەکرێت.
- هەندێ هۆز یا تاکەکەسانی، ڕازی نابن لە کۆڕی ئاشتەوایی دانیشن، گەر هەستیان کرد بەهێزترن لە لایەنەکەی دیکە.
- مافی سکاڵاکار لەناو دەچێت، لەباری ئەوەی سکاڵا نەکات، لەبەر نەبوونی پەڕاوی لێکۆڵینەوەو بەڵگەنامەو ڕاپۆرت، ئەوە بسەلمێنن کەوا خاوەن مافێکی دیاری کراوە.
- لەناوبردنی ڕۆڵی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و دادوەری و داواکاری گشتی لە دابینکردنی دادپەروەری و بەدواداچوون و کۆکردنەوەی بەڵگەکان لە بەرژەوەندیی (سکاڵاکار)ی تاوانلێکراو.
- چارەسازیی هۆزگەری و یاساو سەپاوییەکانی لە هەموو حاڵەتێکدا بژاردەییە، هێزی یاسای نییەو جێبەجێکردنی تەنیا بە ڕەزامەندی هەردوو لایەنە.

ڕاستە دەبینین ڕۆڵی هۆزەکان لە یەکلاکردنەوەی ناکۆکی نێوان تاکەکانی گرنگە، گەر هاتوو دوای سکاڵای داواکار بێت لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە، ئەوکاتە پشتگیری یاسایی زۆرتر دەبێت، لە تەك پشتگیری هۆزگەری بۆ چارەکردنی گرفتەکەو ئازاد دەبێت لە هەڵبژاردن، دەشێ نێوەندگیری هۆزگەری لەو حاڵەتەدا ڕۆڵی گەورەی هەبێت لە خێرا بە ئەنجام گەیشتنی داواکەو گێڕانەوەی مافەکانی بۆ خاوەنەکەی (سکاڵاکارەکە).

لێرەدا گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامەی لە حاڵەتی ڕووداوێکی تاوانکاری دوو ڕێگا هەیە بۆ چارەکردن:

**چارەی یەکەم: لێبوردن**

**چارەی دووەم: سپاردنی بابەتەکە**

بۆ وتووێژی هۆزگەری و ڕازی بوون بە هەموو ئەنجامەکانی، واتە دەشێ ڕووبەڕووی حاڵەتی دڵنیانەبوون لە چارەکردن و لە ڕووی کردارییەوە دژواری لە پەیڕەوکردن ببینەوە، نموونەی ئەوانەش، ئەمانەن:

- **نموونەی یەکەم:** تاوانبارێکی نەناسراو، هێرشت دەکاتە سەر چەکی بەدەستەوەیە، تەقەت لێدەکات و ئەندامێکی خێزانەکەت دەپێکێت و ئۆتۆمۆبێلەکەت دەدزێت و هەڵدێت، لەم حاڵەتەدا تۆ ناتوانیت لێی خۆش بیت یا لێی ببوریی، واتە ناتوانین ڕێبازی ئاشتەوایی، یا هۆزەگەری (عەشائیری) پەیڕەو بکەین، لەبەرئەوەی دەستدرێژییەکە گەورەیەو مەترسیدارەو تۆ تاوانبار هەر ناناسیت.
- **نموونەی دووەم:** کەسێك چەکێکی بێ پشتیوانە (رصید) بۆ تۆ بنووسێت و تۆش دوای گەڕانەوە بۆ بانك دەرکەوێت پشتیوانەی دارایی نییە بۆ خەرجکردنی چەکەکە؟

لەم حاڵەتەدا بواری لێخۆش بوون و لێبوردن نامێنێت، یا چارەی عەشائیری، لەبەرئەوەی دابونەریتە هۆزگەرییەکان (السواني)، تێکەڵی کاروباری بازرگانی نابن و پشتگیری لێناکەن.

- **نموونەی سێیەم:** خانووێك دەکڕیت، دواتر دەردەکەوێت فرۆشیار فێڵبازەو خانووەکەی پێفرۆشتی و پارەکەی وەرگرتووەو خانووەکە ئی ئەو نییە، ئی کەسێکی دیکەیەو ئاگای لەو فرۆشتنە نییە.

ئەم نموونانەی ڕابردوو، ناتوانیت لە ڕێگەی لێبووردن و لێخۆشبوون چارەیان بکەیت، یا لە ڕێی دەستوەردانی عەشائیری، چارەی زیان و قەرەبووی تاوانلێکراو ناکات.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە: باشترین چارە چییە، کەوا مافەکان بەدەست بێنیتەوەو سزای تاوانبار بدات و ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی بپارێزێت، لە ڕێی بڕیارو سەپاویی ناچارەکی و لەسەر هەموو تاکەکان، دادپەروەرانە پەیڕەو بکرێت، وەك ڕێسای گشتی و بێلایەن و ڕەها.

**چارەی سێیەم: سکاڵا لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە:**

ئەوەیان چارەی باشترو نموونەییە، پەیڕەوکردنی یاسایە بۆ هێنانەدی مافەکان، لەبەرئەوەی پشتگوێخستنی مافەکان دەبێتەهۆی کەڵەکەبوونی گرفتەکان و تۆڵەکردنەوەو هێنانەدی دادپەروەری لەلایەن تاکەکەسانەوە، خۆکردەو دوور لە دامەزراوەی دادوەری، گیروگرفتی گەورەتر دروست دەکات و ئەوەشی دواتر ڕوون دەکەینەوە.

## ٢- ئامادەیی سکاڵاکار بۆ سکاڵاکردن:

دیارە مرۆڤ هەر کارێك بکات پێویستی بە ئامادەکاری هەیە، تەواو، یا هەندێك ئامادەکاری دەوێت بەپێی توانست و بارودۆخی مرۆڤەکە، ئەم قۆناخەی تیایدا بڕیاری پەنابردنەبەر دادگای تێدا دەدرێت و پەنابردنە بەر یاسا، لە ڕێگای داوا بەرزکردنەوە، داوای سزایی، پێویستە ئامادەکاری و بارودۆخ لەبار بێت و ڕێکارەکانی پێویست بگیرێنەبەر، سکاڵاکار پێویستە پەیڕەویان بکات، لەوانەش:

یەکەم: ئامادەیی دەروونی (الاستعداد النفسي).

دووەم: ئامادەیی دارایی (الاستعداد المالي).

سێیەم: ئامادەیی یاسایی (الاستعداد القانوني).

چوارەم: ئامادەیی کۆمەڵایەتی (الاستعداد الاجتماعي).

پێنجەم: باوەڕو متمانەی بەخۆبوون و ئازایەتی نواندن.

لە خوارەوە یەك لە دوای یەك باسیان دەکەین:

## یەکەم: ئامادەیی دەروونی (الاستعداد النفسي):

دەبێت لەوە دڵنیابین ژیان بێ گیروگرفت و ناکۆکی نییە، ئەمەیش، لەخۆیدا گیروگرفت نییە، لەبەرئەوەی شتێکی سروشتییە، هەروایە، بەڵام گیروگرفتی ڕاستەقینە ئەوەیە، ئایا تۆ تا چەند توانستی (قدرة) ڕووبەڕووبوونەوەیت هەیە، یەکلایی کەیتەوەو بەسەریدا زاڵ بێت، بە شێوازێکی پیشە زانانە، هەرچەند لەم بوارە تایبەتمەند نەبیت، سکاڵاکردن، بوێرانە لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوە وەستان، تاکە بژاردەی تۆیە لەباری داخستنی ڕێگاکانی دیکە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتەکە، گەر دەستدرێژیت کرایە سەر، لەبارێکی دەروونی گران دا دەبیت و ئاارام دەبیت و سەختە بڕیاری دروست بدەیت، لەم بارودۆخانەدا، کە نالەبارو ناهەموارن، لەم حاڵەتەدا هەستی ستەم لێکراوی و سوکایەتی پێکردن و تووڕەیی و ویستی تۆڵەسەندنەوەت بەسەردا زاڵ دەبێت، هەست و نەستت داگیر دەکات، سەرباری ئەوەی دەیبینیت، لەلای هەندێ نزیکەکانت لە خواستی هاوکاری کردنن، تا ڕادەی هاندانت (تحريض) و زێدەکردنی ناکۆکییەکەو لە دواکایە خۆت بە تەنیا دەبینیتەوە لەنێو گیروگرفتەکەدا.

گرنگترین و مەترسیدارترین گیروگرفتی سکاڵاکار ڕووبەڕووی دەبێتەوە، تێکشکاندنی حاڵەتی دەروونی ئەوەو پووکاندنەوەی ویست و بوێرییەتی پێش ئەوەی بچێتە دادگاو داواکەی بەرزکاتەوە، بەداخەوە کۆمەڵگەی عێراقی خەڵك هاندەدات مافی خۆیان بەدەستی خۆیان وەربگرن و دادپەروەری بەخۆیان بێننەدی و بە سووك سەیری یاساکان کردن و زیان بەناوبانگی دادوەری و پۆلیس و پارێزەران گەیاندن و هەر وێستگەیەکی دی لە وێستگەکانی لێکۆڵینەوەو دادوەری.

پێش ئەوەی ئەم گوتانە لە کەسی دیکە ببیستی با من هەندێ لە وانەت بۆ باس بکەم، گوتەو پەندی وره شکێنن بۆ هەر کەسێك بیەوێت سەردانی دادگە بکات. بەداخەوە زیان بەناوبانگی دامەزراوە دادوەری و جێبەجێکارەکان دەگەیەنێت.

گرنگترین ئەوەی دەوترێت بۆ شکست پێهێنانی ورەی سکاڵاکار، ئەمانەن:

- یاسا گەمژەکان ناپارێزێت.
- شێر مافی خۆی بەخۆی دەستێنێت و پەککەوتە بەدوای شایەت دەگەڕێت.
- ئەوەی شا دەیەوێت یاساش دەیەوێت.
- ئەوەی پارە دەیەوێت یاساش دەیەوێت.
- یاسا وەك تەونی جاڵجاڵۆکە وایە، زیندەوەرە بچووکەکان دەگرێت و باڵندە گەورەکان تێکی دەدەن.
- وڵات بە یاسا دەپارێزن و دەیخەنە قوتوویێکەوەو قوتووەکە دەخەنە گیرفانیانەوە.
- هەرچەند یاسایێکی نوێ دەرچوو، ڕێبازێکی نوێ دەدۆزنەوە بۆ لێی ڕزگار بن.
- ئەوەی جێی ترسە یاسا نییە، دادوەرە.
- گەر یاسا بدوابایە، سکاڵای لە دەست پارێزەران دەکرد.
- پێویستە یاسا دەستەڵاتی لەسەر مرۆڤەوە هەبێت، نەك مرۆڤ دەستەڵای بەسەر یاساوە هەبێت.
- هەموو مافەکان پارێزراون، یاسای باری ناکاو دەیانپارێزێت.
- یاسا نەرمەکان جێبەجێ نابن، یاسا توندەکان جێبەجێ دەکەن.
- بەرتیل وا دەکات سکاڵاکار بووەستێت و یاسا دانیشێت.
- ئەوەندەی یاسا زۆر بن ژمارەی دزان زۆر دەبێت.
- پارێزەر کەسێکی لێهاتووە بۆ فێڵ لە یاساکردن.

- هەندێجار ستەم لە دادوەرەوە نایەت، بەڵکو لە یاساکەوە.
- دادگا نییە یاسا دەنووسێتەوە، بەڵکو دەستەڵاتە یاسا دەنووسێتەوە.
- بەدوای پارێزەرێك مەگەڕێ یاسا بزانێت، بەدوای پارێزەرێك بگەڕێ دادوەر بناسێت.
- ئەو کۆت و بەندانەی پێی ئافرەتان، لە کانزایێك دروست کراوە، دروستکردنی دەستەڵاتی سیاسییە، ئەوەی لاهوت- دین- و فەلسەفەو یاسا دەخاتە خزمەت بەرژەوەندییەکانی.
- هەتا لە مۆسیقاش دەنگی دۆڵ لە دەنگی قانون بەرزترە.
- بە کێشەیەك بچیتە دادگا بەدوان دێیتەوە.
- ئاشتەواییێکی خراپ باشترە لە سکالاییێکی باش.
- دابی باو (عرف) باشترە لە یاساکان.
- پێداویستی یاسا ناناسێت.
- ئاشتیخواز بەو ڕێکێك و ملکەچی یاساو ڕێز لە هەمووان بگرە، گەر کەسێك دەستی لەتۆدا بینێرە بۆ گۆڕستان (بیکوژە).
- مێژوو،ئەو کەسانەی یاخین لە یاسا دەینووسن، هەتا گەر لە نێو دەریادا بن.
- یاسا چاڵێکی بێ بنە.
- ئەو یاسایەی لەسەر هەمووان پەیرەوی ناکرێت ڕێزی لێ ناگیرێت.
- یاسا شمشێرێکە بەسەر ئەستۆی (مل)ی هەژارانەوەو سۆلێکە- مداس- لە پێی دەوڵەمەندان.
- چەند ساویلکەین، کەوا دەزانین یاسا دەفری دادپەروەری و ڕاستییە.
- گەورەی یاسا بە نەك کۆیلەی، مەبە کۆیلەی شتێك خۆت دروستت کردووە.

- یاسای دادپەروەر کە س ناچار ناکات لەژێر پردان بنوون و دەرۆزە بکەن و دزی بکەن.
- گەر دادوەری مریشك بێت دەنکە گەنم سکاڵا لە کێ بکەن.
- ئای لەو یاسایەی بە ڕۆژ حوکمی پێ دەکەن- دەیسەپێنن و بە شەو سەمای لە دیار دەکەن.

**ئێستاکە هەموو قسەکانت خوێندەوە ئایە ڕات چییە؟**

هەموو قسەکانی پێشوو و لەوەش زۆرتر دەبیستین و هاوچەشنەکانیان لەو دوانانەی گومان دەخەنە دڵەوەو کار لەسەر بێهێزکردنی ئامادەیی دەروونیت لە بەردەوام بوون لە شەڕی سکاڵاو کەمکردنەوەی متمانەت بە لێکۆڵەری پۆلیس و پارێزەرو دادوەریش.

ئەم هەموو دەستەواژە بە ژاوە ژاوەکانی ڕابردوو لە یاسادا هیچ بەهایەکیان نییە، هیچ ئاوڕیان لێ مەدەوە، دەستەواژەی ئەدەبی و ناڕاستن و چەندان لێکدانەوە هەڵدەگرن، بێگومان هاندەری سیاسی لە پشت ئەوانەن، لە داڕشتن و بڵاوکردنەوەیان، دوور لە هەڵکەوتی سکاڵای سزایی، چی پەیوەست بە تۆ یا هەر کەسێك کە هیچ نەچۆتە بنکەیێکی پۆلیس ،یا لە زاری شاعیر یا ئەدیب یا پیتۆڵێك یا بەرهەڵستکارێکی سیاسی دەرچووە، تایبەتمەند نییە لە یاسا.

بڕیاری دروست ئەوەیە، ئەم قسانە پشگوێ بخەیت، ئەو قسانەی گومان لە کێشەکەت دەکەن و باوەڕدار بەو متمانەت بەخۆت بێت و بە کێشەکەت و تیمی کاری لەگەڵت دان بەتایبەتی پارێزەرو خۆت باش ئامادە بکەو جێگیر بەو دوورکەوە لە تووڕەیی و گومان، لەدواکایە بزانە یاسا دەتپارێزێت و هەموو کەس دەپارێزێت، تا ئەو ڕادەی گێلەکانیش دەپارێزێت و هەژارو نەزانەکانیش و شێتەکانیش دەپارێزێت، بەڵکو دارو بەردو هەموو شتێك دەپارێزێت.

## دووەم: ئامادەیی دارایی (الاستعداد المالي):

هەموو سکاڵایێك برە پارەیێکی دەوێت بۆ کرێ و خەرجی و رسومات و ماندوێتی پارێزەران و خەرجی دیکەی نادیار، ئەم برە پارەیە نەگۆڕ نییە، رێژەییە بەپێی قەوارەی داواکەو جۆرو بارودۆخەکەی بەمشێوەیە سکاڵاکار پێویستە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرێت:

أ- پێویستە برە پارەیێك دابنێت بۆ خەرجی سکاڵا.

ب- پارێزەرێکی لێهاتوو بکاتە بریکاری خۆی بۆ ئەوەی بەدواداچوون بۆ سکاڵاکە بکات، هەرچەند پارێزەرێکی لاویش بێت و ماندووانەی (أتعاب) کەم بێت.

ج- دەکرێ لەگەڵ پارێزەرەکە رێك بکەون پێشەکییەکی ماندووانە (أتعاب) بدەیت، دواتر، کە داواکە یەکلایی بووەوە ئەوەی دیکە بدەیت، وەك وەرگرتنی قەرەبوو، گەر توانای دابینکردنی هەموو ماندووانەکەت نەبوو.

د- دەکرێ یارمەتی پارێزەر بدەیت لە گەیاندنی داخوازییەکان (طلبيات) بۆ بنکەی پۆلیس و رسومات دان و ئاگاداربوون لە پێڕاگەیاندن (تبليغ) و فەرمانی گرتن و بۆ گەڕان (تحري) و بەمجۆرە کەمێك لە ماندووانە کە کەم دەکەیتەوە.

هـ- گرێبەستی کار لەگەڵ پارێزەرەکە بنووسە بە هەموو وردەکارییەکان بۆ دڵنیابوون لە مافەکانی هەردوو لایەن.

## سێیەم: ئامادەیی یاسایی (الاستعداد القانوني):

سکاڵاکار پێویستە بە نەزانی داواکە بەرز نەکاتەوە، دەبێت شتێك لە یاسا بزانێت، واتە سکاڵاکارێك بێت ڕادەیەك ڕۆشنبیریی یاسایی هەبێت.

هەروەها پێویستە ئەم خاڵانەی لەبەرچاو بێت:

- پارێزەرێکی شارەزا لە یاساو ناوبانگ باشی و تایبەتمەند بکاتە بریکاری خۆی.
- پێویستە یاسای سزاکانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی خوێندبێتەوە پەیوەست بە بابەتی سکاڵاکەی و ماددە یاساییەکانی بزانێت و وتووێژ لەگەڵ پارێزەرەکەی بکات.
- هەروەها ئاگاداری یاسای بنەماکانی دادگا سزاییەکان، ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٧١ بێت.
- پێویستە سکاڵاکار لە ئینتەرنێت (گوگل) بەکاربێنێت بۆ بابەتی سکاڵاکەی و زانیاری ورد لەبارەی بابەتەکە بزانێت و چی بڵاوکراونەتەوە لەو کارو توێژینەوەو بڕیاری دادوەری.
- پێویستە سکاڵاکار متمانەی بە بریکارە پارێزەرەکەی هەبێت، بەردەوام سەری لێبدات لە نووسینگەکەی بۆ ئەوەی هانی بدات بۆ بەدواداچوون بۆ کێشەکەی، بەڵام ماوە کورت و بێ پێداگرتن، تا دڵنیابێت لە ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوەو ڕەوانەکردنی بۆ دادگەی تایبەتمەند نەوەك لەبیر بکرێت لە چەکمەجەکانی بنکەی پۆلیس.
- بایەخدان بە لایەنی یاسایی شایەتەکانی سەلماندن و بە ئامادەبوونی پارێزەر لەگەڵیان کۆبێتەوە بۆ ڕێکخستنی شایەتیدان بەپێی ڕووداوەکەو نەبوونی نەسازی یا کەموکورتی یا بیرچوونەوە لە قسەی - وتەی - شایەتەکانەوە کە لەلایەن نەیار (خصم)ـەوە سوودی لێ ببیندرێت.

## چوارەم: ئامادەیی کۆمەڵایەتی (الاستعداد الاجتماعي):

زۆربەری جاران لەوکاتەی کەسێك دووچاری دەستدرێژی دەبێتەوە، بایەخدان و یارمەتی لەلایەن کەسانی دیکە پێشنیاز دەکرێت، بەتایبەتی خێزان و بنەماڵەو برادەران و هاوسێیان، سکاڵاکار پێویستە ئەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی سوودی لێ ببینێت.

لەم بوارەدا، ئەم ڕاسپاردانەمان هەیە:

أ- هەوڵدان بە گەورەی بنەماڵە یا عەشیرەت بە وردەکاریی تاوانەکەو خواستی ئەوەی دەیەوێت سکاڵا بکات، لەبەردەم دادوەر بۆ گەڕانەوەی ڕێزو شکۆی و سزادانی تاوانکار و قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی پێی گەیشتوون.

ب- دوورکەوتنەوە لە نەیار، ناکۆك و پەیوەندی پێوەنەکردن و کەس نەنێرێت بۆ لای نەیارەکەی.

ج- خێزانی لەوە ئاگادار بکاتەوە دەیەوێت سکاڵا دژی تاوانکار بەرزکاتەوەو داوایان لێبکات دوورکەونەوە لە قسەو کرداری کار دەکاتە سەر ڕەوتی سکاڵاکە بەتایبەتی کاردانەوەو تۆڵەکردنەوە، بۆ ئەوەی مافەکەیان نەفەوتێت.

د- داوا بەرزکردنەوەکە بە نهێنی بێت، تا دوا بڕیاری دادگە لەم بارەوەو تەواوبوونی لێکۆڵینەوە، بۆ ئەوەی دەرفەت نەدرێت بە نەیارەکە بۆ هەڵاتن، یا سکاڵای فێڵکاری (کیدی) بەرانبەر سکاڵای ئەوان.

## پێنجەم: باوەڕو متمانە بەخۆبوون و ئازایەتی نواندن:

مرۆی ئازا دەشێ هەمووان گوێی بۆ بگرن و گرنگی پێبدەن، بەتایبەتی گەر ئازایەتییەکەی هۆشمەندانە بێت و رۆشنبیری یاسایی لەگەڵدا بێت، لۆجیك بێت و پۆشاکی کەسەکە ڕێکوپێك بێت.

ئازایەتی و متمانە بەخۆبوون کاریگەری بەرچاوی هەیە لەسەر داوای ماف کردن و کەوتنە دوو تاوانکار تا دەدرێتە دادگای دادپەروەرانەو تا گەیشتن بە گێڕانەوەی شکۆ بۆ سکاڵاکارو قەرەبووی زیانەکان.

شەمەندەفەری سکاڵا بەزۆر وێستگەدا دەڕوات و هەر وێستگەیەك پەیوەستە بەوەی دیکە لە ڕێگەی یاساوە، یەکەم وێستگە، وێستگەی پارێزەرە، بریکاری سکاڵاکارو ئەندازیاری سکاڵاکەو دواتر ئێستگەکانی دیکە یەك لە دوای یەك دەستپێدە کەن، لە ئەفسەری بنکە تا لێکۆڵەرو داواکاری گشتی و دادوەری لێکۆڵینەوە، تا دادگەی بابەت و لایەنە دادوەرییەکانی تێهەڵچوونەوەی دیکە، هەموو ئەم وێستگانە پێویستی بە سواربوونی شەمەندەفەری خۆڕاگری و ئازایەتی و هێمنی هەیە، رێبواریی سکاڵا بەم هەموو وێستگە یاساییانەدا، وا پێویست دەکات سکاڵاکار متمانەی بەخۆی بێت و بە پارێزەرەکەی و گوێ نەداتە ڕێنمایی کەسانی دیکە، ئەوانەی شارەزا نین لە یاساو پیشەیی نین تیایدا، لەوکاتەدا بەهانەو بەڵگەی سکاڵاکار بەهێزو کاریگەر دەبێت و ڕەفتارەکانی کاریگەر دەبێ و شوونەواری دیار لەسەر بڕیارەکان دادەنێت کەوا لەمەڕ داواکە دەردەچن.

**بۆ بەهێزکردنی گیانی ئازایەتی ئەم ڕاسپاردانەمان هەن:**

أ- گیانی شەڕوانی ئازاو بە جەرگی هەبێت، لە بەدواداچوون بۆ سکاڵاکەو خاوەنەبێتەوەو دوورنەکەوێتەوە لە یاساو ڕووبەڕووبوونەوەی هەر کۆسپێك دێتەڕێی و یا هەر گیروگرفتێ لە ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە پەیدا دەبن، یا گومان لێکردن بەبێ بەڵگەو پاساو.

ب- دووركەوتنەوە لە تۆمەتبارکردنی کەسانی دیکە بە کەموکورتی یا پشتگوێخستن یا بەرتیل دان.

ج- لە ڕاکردن، یا بێهێزی و گلەیی دووركەوتنەوە، یا پرسیار لە ئەوەی هیچ پەیوەندی بە پرسەکەوە نییە.

د- وازنەهێنان تا دابین بوونی هۆکاری ڕەزامەندیی دەروونی لای سکاڵاکار لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە (مایەکی و گوزارەیی)

ە- دووركەوتنەوە لە قسەلۆك و ناوزڕاندن و زیانگەیاندن بەناوبانگی نەیارو هەڕەشە، یا نامەناردن لەمبارەیەوە، بایەخدان بە بەردەوامی و بەدواداچوون بۆ سکاڵاکە، بە ئاکاری سوارچاکانەو ئازایەتی بەگژادان، بەمجۆرەی یاسا ڕێگای بۆ دانەوە.

## ٣- پێناسەی سکاڵای سزایی و نموونەکەی:

واباوە پێناسە زانستییەکان سەبارەت خوازیاری سکاڵا، گرنگیان نییە!، گوایە ناشێ سکاڵاکار واز لە سکاڵای بێنێت و دەست بکات بە خوێندنەوەی پێناسەی زانستیی و زاراوەی یاسایی، بەڵام ڕاستی ئەوەیە هەر ماف خوازێك پێش چوونە نێو شەڕی یاسایی وەك سکاڵاکار تا ڕادەیەك ئاگاداری بابەتی سکاڵاکەی بێت لەڕووی یاسایی، ئەوە یارمەتی دەدات و پشتگیرییە پێش چوونە نێو شورای دادگەو دەست بە سکاڵاکردن.

هەروەها بۆ خستنەڕووی سروشتی مافەکانی سکاڵاکارو پابەندییەکانی و هەڵوێستی کۆمەڵگە بەرانبەری، لەبەرئەوەی سکاڵاکار ئەرکی تەواو دەبێت، بە تەواوبوونی ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوەی دادوەری و ئەوەی دەمێنێت کاری لایەنەکانی لێکۆڵینەوەو دادوەرییە بە سەرپەرشتی دەوڵەت، بە نوێنەرایەتی داواکاری گشتی و دادوەر.

پرسیار: ئایا دەکرێ سکاڵا بکەیت و نەزانی سکاڵا لە ڕووی یاسایی واتای چییە؟

لێرە لە ڕووی زانستی و ئەکادیمییەوە واتای سکاڵا ڕووندەکەینەوە:

## یەکەم: پێناسەی سکاڵا:

### پێناسەی سکاڵا لە ڕووی کردارییەوە:

خوازنامە (عریضة)یێکی نووسراوە، زیانلێکەوتوو پێشکەشی لایەنە تایبەتمەندەکانی دەکات بۆ داوای جێبەجێکردنی دادپەروەری و قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی دروست بووەو سزادانی تاوانکار دوای ئەوەی ڕەسمی یاسایی دەدات.

زۆر جۆر پێناسەی سکاڵا هەن، ئەمە بەشێکیانە:

لای (کوی هی): ئەم ئامرازەیە لە ڕێگەیەوە کۆمەڵگە دەتوانێت، لە ڕێگەی دادوەری، تاوانکار سزا بدات، کەوا ئاسایشی تێکداوەو بەرژەوەندیی خستۆتە مەترسییەوە، بە داوایەکی سزایی دەستپێدەکات و زۆربەی جاران بە سزادانی کۆتایی دێت.

هەروەها پێناسە دەکرێت بە (مافی دەوڵەت لە نوێنەرایەتی دەستەڵاتی تۆمەتبارکردن بۆ کەوتنە دوای (ملاحقة) تاوانکار و خستنیە بەردەستی دادوەری بۆ ئەوەی سزای تاوانکاریی لەسەریەتی بدات.

دیسان سکاڵا پێناسە دەکرێت بە (پێراگەیاندنی تاوانبەرانبەر کراو، یا ئەوەی جێگرەوەیەتی بەپێی یاسا بۆ دەسەڵاتدارانی تایبەتمەند، بەپێی مادەی (١) لە یاسای بنەماکانی دادگا سزاییەکان سەبارەت تاوانی دژی کراوەو داوای جێبەجێکردنی یاسا دەکات لەسەری).

## دووەم: نموونەی خوازنامەی (عریضة) سکاڵای سزایی:

بەڕێز دادوەری لێکۆڵینەوەی دادگەی (          )ی بەڕێز

سکاڵاکار/ ناوی سیانی و ناسناو/ کار/ ناونیشان/

سکاڵا لەسەرکراو/ ناوی سیانی و ناسناو/ کار/ ناونیشان/

لایەنی سکاڵا/

سکاڵای لەسەرکراو، بە سیفەتی کەسی، لاملە (یمتنع) و بڕیاری دادگە جێبەجێ ناکات بە ژمارەی ( ) و لە ڕێکەوتی ( / / )ی لە دادگەی ئێوە دەرچووە، هەرچەندە هەشت ڕۆژی بەسەرداچووە، لە ڕێکەوتی دەرچوونییەوەو بە ڕەسمی وریایی (انذار)ی دراوەتێ بۆ جێبەجێکردنی لە فەرمانگەی جێبەجێکردنی، بۆ زانین جێبەجێکردنە لە دەستەڵاتی و تایبەتمەندی ئەوانە، لەبەرئەوەی ئەم کارەی باسم کرد پێچەوانەی سەپاندنی مادەی ٣/٣٢٩ی یاسای سزاکانی بەرکارە، من لە سکاڵای دژی ئەوە داوا دەکەم هەموو ڕێکارەکانی یاسایی بەرانبەر بگیرێتەبەر.

**سوپاس و ڕێز بۆ دادگاکەتان**

**سکاڵاکار**
**/ /٣/ ٢٠٢٣**

**بەڵگە سەلمێنەکان**

١. بڕیاری دادگا

٢. دانەیێك لە وریاکردنەوە

٣. پەڕاوەکانی سکاڵاکار واژۆی سکاڵاکار: ناو: ناونیشان:

## ٤- شوێنی پێشکەشکردنی سکاڵای سزایی:

لە بنەڕەتدا ئەوەیە دەبێت سکاڵا پێشکەشی دادوەری لێکۆڵینەوەی کەرتی جوگرافی شوێنی تاوانکردنەکە بکرێت، کەوا دادگەی لێکۆڵینەوەکەی لێیە، نابێت پێشکەشی دادگەیێکی دیکە بکرێت هەتا گەر تۆمەتبار لەلایەن ئەو کەرتە جوگرافییەوە گیرابێت، لەبەرئەوەی یاسای عێراقی شوێنی دەستگیرکردنی تۆمەتباری نەکردۆتە پێوەری دیارکردنی تایبەتمەندیی شوێنیی بۆ سکاڵاکردن.

یاسادانەری عێراقی ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، لە دەقی مادەی ١/ أ/ لە باسی بنەماکانی دادگا سزاییەکانی بەرکار، لایەنی سکاڵای پێشکەش دەکرێت، دادوەری لێکۆڵینەوەو لێکۆڵەرە، یا بەرپرسی بنکەی پۆلیس یا هەریەك لە ئەندامانی ڕێکهێنانی دادوەری.

لەبەرئەوەی شوێنی پێشکەشکردنی سکاڵا لە ڕووی یاساییەوە، ئەو شوێنەیە تاوانەکەی تیا ڕوویداوە، یا کارێکی تیا ڕوویداوەو پێکهاتەیەکی تاوانەکەیە، بەمجۆرە دادگەی لێکۆڵینەوە، یا بنکەی پۆلیسی تایبەتمەند دیار دەکرێت.

لێرەدا پرسیار ئەمەیە: ئایا سکاڵاکار بە ڕەهایی ئازادە لەوەی سکاڵاکەی لەبەردەم هەر دادگەیێك، یا لەبەردەم هەر بنکەیێکی پۆلیس هەبێت پێشکەشی بکات؟

وەڵام: نەخێر، ئەوە نابێت، لەبەرئەوەی شوێنی پێشکەشکردنی سکاڵا، بە یاسا دیارکراوە، ناکرێ سەرپێچی لێبکرێت، بەڵام لە حاڵەتی سەرپێچی کردن، بە پووچ داناندرێت، بۆ نموونە: گەر ڕووداوێکی هاتوچۆ لە پارێزگای (هەولێر) لە مەڵبەندی (شقلاوە) (قەزا)ی (شقلاوە) ڕوویدا، دادگەی لێکۆڵینەوەی شقلاوە، ئەوە دادگای تایبەتمەند بۆ لێکۆڵینەوە.

دەشێ شوێنی سکاڵاکردن لەبەردەم دادگەی تایبەتمەند لەم حاڵەتانەدا دیار بکرێت:

أ- ئەو شوێنەی تاوانەکەی بە تەواوی تیادا ڕوویدا.

ب- ئەو شوێنەی بەشێك لە تاوانەکەی تیا ڕوویدا یا ئەنجامەکەی.

ج- ئەو شوێنەی بەشێك لە تاوانە بەردەوامەکەی تیا ڕوویدا.

د- ئەو شوێنەی ئەو سامانەی تیادایە کە تاوانەکەی بۆ کراوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە ئەم چەند نموونانە دێنینەوە:

**نموونەی یەکەم (١):**

دوو ئۆتۆمۆبێل بەریەك کەوتن لە قەزای (سۆران)، شوفێری یەکێك لە ئۆتۆمۆبێلەکان هەڵات چوو بۆ قەزای (هەریر)، ئەوەی دووەم کەوتە دووی تا وەستاو بوو بە شەڕیان و یەکێکیان بەرەنگاری ئەوەی دیکە بووەو دەستدرێژی کردە سەر؟

**پرسیار: سکاڵا لە کوێدا بکرێت؟**

وەڵام: لە بنجدا، مافی ئەوەت هەیە سکاڵا لە شوێنی پێکدادانەکە بکەیت، دادگەی لێکۆڵینەوەی هەریر، هەروەها دەشێ سکاڵا بخرێتە بەردەم دادگەی لێکۆڵینەوەی سۆران لەبارەی تاوانی دەستدرێژی، هەروەها مافی دادوەری لێکۆڵینەوەی سۆران، هەردوو سکاڵا یەك بخات، گەر ویستی کۆیان بکاتەوە، لەبەرئەوەی سەبارەت یەك بابەتە، بۆ بەرچاو ڕوونی.

**نموونەی دووەم (٢):**

گەر کەسێك تەقەی لە کەسێکی دیکە کرد، لە قەزای سۆران، بریندارەکەی گواستەوە نەخۆشخانەی قەزای شقلاوە، لەوێ مرد.

**پرسیار: شوێنی سکاڵا پێشکەش کردن دیار بکە؟**

وەڵام: دەشێ لەبەردەم دادگەی لێکۆڵینەوەی سۆران، یان شقلاوە سکاڵا بکرێت، لەبەرئەوەی تاوانی کوشتن و مردن هەردووکیان بەشێکن لە کۆڵەگەی مادیی تاوانەکە، ئەم جۆرە تاوانە بە تاوانی کاتگیر (جريمة وقتية) ناسراوە.

**نموونەی سێیەم (٣):**

ئەحمەد، بێ مۆڵەت، ئۆتۆمۆبێل لێدەخورێت لە (خەلیفان)ەوە بۆ (سۆران) و لە قەزای (رواندوز) دەگیرێت.

**پرسیار: کامە دادگا تایبەتمەندە بە ڕوانینە داواکە؟**

وەڵام: هەرسێ دادگای لێکۆڵینەوە، (خەلیفان) و (سۆران) و (رواندوز) تایبەتمەندن بە ڕوانینە ئەم داوایە، لەبەرئەوەی تاوانی ئۆتۆمۆبێل هاژۆشتن، بێ مۆڵەت، لە تاوانە بەردەوامەکانەو لە تاوانە ئاوێتەو یەك لە دوای یەکەکانە، واتە: هەر رێك تیایدا لە هەر شوێنێك وادەکات ئەو شوێنە تایبەتمەند بێت بە ڕوانینە سکاڵاکە.

## تێبینیەکی گرنگ:

هەندێ جار سکاڵا دەدرێتە دادوەری لێکۆڵینەوەی ناتایبەتمەند بە ڕووداوەکە، ئەویش ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە دەکات، دواتر دەردەکەوێت لە تایبەتمەندی شوێنی ئەودا نییە بڕوانێتە ئەم داوایە، لێرەدا ڕێکارەکانی دادوەرەکە دروستن و پووچ نین و هەرچەند جیا لە ڕەچاوکردنی تایبەتمەندی شوێنی دراون، لەبەرئەوەی لە سیستەمی

گشتیدا نییە، یا لایەنەکانی داوا مەبەستیان نەبوو، سەرپێچی ڕێساکانی تایبەتمەندیی شوێنی بکەن، تا دژی سروشتی تاوانەکە بێت، واتە ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە دروستە، ڕەفتارەکانی لایەنی داوا دروست نین.

بە کورتی، تایبەتمەندیی شوێن، بەو شوێنە دیاری دەکرێت کەوا تاوانەکەی تیا ڕوویداوە هەمووی، یا بەشێکی، یا هەر کارێك تەواوکاری بێت، یا لە ئەنجامی ئەو یا بەشێك بێت لە تاوانی ئاوێتە، یا بەردەوام یا یەك لە دوای یەك بێت.

تایبەتمەندیی لێکۆڵینەوە بەو شوێنە دیار دەکرێت کەوا تاوانەکەی تیادا ڕوویداوە، یا بەشێکی یا تەواوکاری بێت، یا هەر ئەنجامێکی لێبکەوێتەوە، یان کارێك بێت بەشێك بێت لە تاوانی ئاوێتە (مرکب)، یا بەردەوام (مستمر)، یا یەك لە دوای یەك (متتابعة)، یا تاوانی ڕاهاتن (العادة)، هەروەها دیا دەکرێت بەوەی تاوانلێکراوی تیایە، یا لەچی حاڵەت دایە، کە تاوان بۆی کراوە، دوای گواستنەوەی لە ڕێی بکەرەکەی یا تایبەتمەندێکی ئاگای لێ ببوو بێت.

گەر دادوەری لێکۆڵینەوەی پەڕاوەکانی بۆ ڕەوانەکراوە وای بۆچوو، ئەو تایبەتمەند نییە بە لێکۆڵینەوە تیایدا، دەبێت لە دادگەی پێداچوونەوە باسی بکات و هۆکارەکانی دیار بکات بۆ ئەوەی دادگە بڕیاری دانانی دادوەرێکی دیکەی تایبەتمەند بدات، بەخێراو خۆی بەردەوام دەبێت لە لێکۆڵینەوە تا دادگەی پێداچوونەوە بڕیاری خۆی لەبارەی بابەتەکە دەدات.

گەر تاوانەکە لە دەرەوەی عێراق ڕوویدا، لێکۆڵینەوە تیایدا لەلایەن، دادوەرێکی لێکۆڵینەوە دەکرێت بۆ ئەو مەبەستە دەنێردرێت، بە ڕەزامەندی سەرۆکی دادوەریی باڵا، گەر بۆی دەرکەوت دادوەرەکە، تایبەتمەند نییە بە لێکۆڵینەوە لەم جۆرە تاوانە.

دادوەرەکە، گەر بۆی دەرکەوت، تایبەتمەند نییە بە لێکۆڵینەوە لەم جۆرە جۆرە تاوانە، پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوە دەنێرێت بۆ دادوەرێکی تایبەتمەند.

- لە تاوانێکدا فرە تۆمەتبار هەبن، سکاڵا، یا هەواڵدان دژی هەندێکیان بکرێت بۆ لایەنە تایبەتمەندەکان و سەبارەت هەندێکیان بۆ لایەنێکی دیکەی لێکۆڵینەوەی تایبەتمەند، پێویستە پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوە بنێردرێن بۆ ئەو لایەنەی سکاڵا یا هەواڵدانەکەی پێشکەش کردووە (مادەی ٥/ ب).

- گەر ناکۆکی لە تایبەتمەندی لە نێوان دوو لایەن پەیدا بوو، یا زیاتر لە لایەنەکانی لێکۆڵینەوە، ناکۆکییەکە دەنێردرێتە دادگەی پێداچوونەوەی فیدراڵی بۆ دەرچوواندنی بڕیارێك بە دیارکردنی لایەنی تایبەتمەند.

- ((دەشێ داوا بگوازرێتەوە لە تایبەتمەندیی دادوەری لێکۆڵینەوەیێك بۆ تایبەتمەندیی دادوەرێکی لێکۆڵینەوەی دیکە، بە فەرمانی سەرۆکی ئەنجوومەنی دادوەریی باڵا، یا بە بڕیارێك لە دادگەی تاوانکارییەکان، لە ناوچەکەی، گەر پێویست بوو، لەبەر پێداویستی بارودۆخی ئاسایش یا گواستنەوەی دەبووە هۆی دەرکەوتنی ڕاستیی (مادەی ٥٥/ ب).

## ٥- چ کەسێک مافی داوای سکاڵای سزایی هەیە؟

زیانبەرکەوتوو لە تاوان، سکاڵای سزایی دەجووڵێنێت، یا ئەوەی بەپێی یاسا جێگرەوەیەتی، یا هەر کەسێك ئاگاداری ڕوودانی بوو، یا هەواڵدانێك لە هەریەك لەوانەوە بۆ داواکاری گشتی.

جگە لەوەی یاسا بە دەق ئاماژەی پێبکردبێت، (مادەی ٥٥/ ب) یاسای بنەماکانی دادگا سزاییەکانی بەرکار)

لە بنجدا هەر کەسێکی سروشتی (مرۆڤ)، یا گوزارەیی (معنوي) (کۆمپانیا یا وەزارەتەکان یا کۆمەڵەکان بۆیان هەیە سکاڵا پێشکەشی دادگای لێکۆڵینەوە بکەن سەبارەت تاوانی لە عێراق ڕوودەدات و بۆی هەیە سکاڵا لە کەسی دیکە بکات گەر خاوەن کەسێتیی یاسایی بێت، وەك ئەوەی بریکار یا سەرپەرشتیار (ولي) یا راسپاردەو (وصي) یا پێشکار (قيم) بێت.

لەبەرئەمە یاسا مۆڵەتی داوە سکاڵا ڕاستەوخۆ بکرێت لەبەردەم دادگاکانی لێکۆڵینەوە بۆ چەندان لایەن، لەوانە:

أ- هەر کەسێك تاوانی بەرانبەرکراو بەشێوەیەکی کەسی زیانمەند بوو.

ب- ئەوەی سیفەتی یاسایی هەبوو، وەك: بریکار، یا سەرپەرشتکار (ولي)، یا ڕاسپاردە (وصي)، یا پێشکاری (قيم.

ج- داواکاری گشتی یا نوێنەری بوو.

د- هەموو کەسێتییە گوزارەییە ڕێزدارەکان لە یاساداو سەرۆکی نوێنەرایەتی دەکات سەرباری فرمانەکەی.

هـ- دادگاکان، لە حاڵەتی تاوانکردن، لەکاتی بینینی داوا لەبەردەمیدا.

و- کەسی بیانی یا نیشتەجێ لە عێراق بەشێوەیەکی فەرمی.

ز- هەموو فەرمانبەرێك یا ڕاسپێردراو بە خزمەتی گشتی لەبارەی ئەوەی لە ئەرك و فرمانەکەی یا کارەکەی دەکەوێتەوە.

ح- هەر کەسێك لەکاتی تاوانکردن ئامادەبووبێت.

ط- کەسێك دادگە دایدەنێت لەبری ڕاسپاردە یا سەرپەرشتیار یا پێشکار، لەباری ناکۆك بوونی بەرژەوەندیان لەگەڵ کەسی ئەوان ئاگایان لێیەتی و سەخبیری دەکەن (رعاية).

هـ- بنج و لك و براو خوشکانی تاوانلێکراو لە تاوانی نەشیاوان (جرائم المحارم) (مادە ٣٠٥/ یاسای سزاکان).

بەکورتی، دەرگاکانی دادوەری کراوەن بۆ وەرگرتنی سکاڵای سزایی و نەگێڕانەوە، هیچ کەسێك چی سروشتی یا گوزارەیی (معنوي) بۆ هێنانەدی ماف و دادپەروەری و قەرەبووی زیان و سزادانی تاوانباران.

## ٦- حاڵەتەکانی سکاڵا وەرنەگرتن لەلایەن دادوەرەوە:

لە بنجدا دەبێت دادوەری سکاڵای کەسان وەربگرێت و دەست بە ڕێکارەکان بکات و بەخێرایی بۆ دابینکردنی مافی کەسەکان و هەوڵدان بۆ هێنانەدی ماف و دادپەروەری، بەڵام هەندێ حاڵەت هەن تایبەتن، یاسا بڕیاری وەرنەگرتنی سکاڵای داوە تیایدا، ئەمانەن:

یەکەم: سکاڵا دەبێت تاوانلێکراو خۆی یا ئەوەی نوێنەرایەتی دەکات بەپێی یاسا پێشکەشی بکات، نەك پارێزەرەکەی هەرچەند بریکارەکەش سزای تایبەتی پێبێت، لەبەرئەوەی سکاڵا مافی کەسییە، بریکاری تیا نابێت، مەگەر ناکام (قاصر)، یا کەسێتی گوزارەیی (معنوي) بێت.

دووەم: گەر یاسا بۆ جووڵاندنی داوای سزایی سکاڵاکردن بە مەرج دابنێت، هیچ ڕێکارێك دژی تاوانکار ناگیرێتەبەر تەنیا دوای سکاڵاکردن نەبێت، سکاڵاکار گەر بێ بەدواداچوون وازی هێنا بۆ ماوەی سێ مانگ، بێ بەهانەی ڕەوا، بە وازهێناو (متنازل) دادەندرێت و دادوەری لێکۆڵینەوە بڕیاری ڕەتکردنەوەی سکاڵاکەی دەدات و داواکەی بە یەکجاری دادەخات.

سێیەم: هیچ تاوانێك لە ئاراداً نییە، گەر کەسێك تاوانی کوشتن یا دەستدرێژی کردە سەر، یا بەزۆر لاقەی نەشیاوێکی بکوژی کرد، بە بارودۆخی تونگر (توندکردن) دادەندرێت لەلایەن بکوژ گەر بۆ تۆڵەسەندنەوە بێت.

چوارەم: دادگەی سزایی ناڕوانێتە داوا شارستانی بە پاشکۆیی نەبێت بۆ داوای سزایی.

مەبەست ئەوەیە دادوەری لێکۆڵینەوە داواکاری(عریضة)ی داواکە وەرناگرێت، گەر داخوازییەکە تەنیا قەرەبوو بێت بێ سکاڵای سزایی دژی تۆمەتبارو ڕێکاری یاساییەکانی گرتنەبەر لە دژی دا.

پێنجەم/ سکاڵا لە میراتگرانی ئەو کەسە وەرناگیرێت کە مافی داوای سکاڵای هەیە لە حاڵەتی مردنی.

شەشەم/ گەر سکاڵاکار وازی لە سکاڵاکە هێنا.

حەوتەم/ داوای سزایی ناجووڵێندرێت سەبارەت ئەو تاوانانەی لە دەرەوەی عێراق دەکرێت، بە مۆڵەتدانی سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای دادوەری نەبێت.

هەشتەم/ ئەو منداڵەی تەمەنی حەوتساڵی تەواو نەکردووە، داوای سزایی لەمەڕ نابزوێندرێت.

نۆیەم: داوای سزایی ناجووڵێندرێت، بە سکاڵای تاوانبەرانبەرکراو نەبێت، یا ئەوەی جێگرەوەیەتی بە یاسا، لەم تاوانانەی خوارەوە: بەپێی بڕگەکانی ماددەی (٣) لە یاسای بنەماکانی سزای عێراقی ژمارە(٢٣) ساڵی ١٩٧١.

- زینای هاوسەری، یا فرەژنی بە پێچەوانەی یاسای باری کەسی.
- ناوزڕاندن، یا جوێن، یا نهێنی درکاندن، یا هەڕەشە، یا ئازاردان، گەر تاوانەکە دژی کارمەندێکی خزمەتی گشتی نەبێت یا لەکاردا بێت یا بەهۆی کارەکەیەوە بێت.
- دزی یا دەستدرێژی سێکسی یا ناپاکی لە ئەمانەت، یا فێڵ کردن، یا بن دەستکردنی ئەو شتانەی لە فێڵکردن دەردەست کراون، گەر تاوانلێکراو پەیوەست بە تاوانکار یا ڕەچەڵەك یا بنەچەی و وەچەی بێت، ئەم شتانەش گلنەرابوونەوە، بە سەپاندنی دادوەری یا کارگێڕی، یا مافی کەسی دیکەیان لەسەر بێت.
- تێکدانی سامان یا وێرانکردنی، جگە لە سامانی دەوڵەت، گەر تاوانەکە هاوگری (مقترن) بارودۆخی توندکار نەبوو.

- پێشێلکردنی ڕێزی موڵك یا چوونە نێو یا ڕەتبوون لە زەوییەکی چێندراو یا ئامادەکراو بۆ چاندن، یا زەوی بەروبوومی تێدا بێت یا ڕێنەدرێت ئاژەڵی بچێتە ناو.
- بەردو شتی دیکە هاوێشتنە ئامرازەکانی گواستنەوە یاماڵان یا باڵەخانە یا بێستان یا کۆزەکان.
- تاوانەکانی دیکەی یاسا بە دەق باسیان دەکات، کەوا داواکان ناجووڵێندرێن، بە سکاڵای زیانبەرکەوتوو نەبێت.
- سکاڵا لەو تاوانانەی لە مادەی (٣)ی سەرەوە وەرناگیرێت، لە یاسای بنەماکانی دوای سێ مانگ لە ڕۆژی ئاگاداربوونی تاوانبەرانبەرکراو بە تاوانەکە، یا نەمانی زیانەکە بە ناچارەکی، ئەوەی بووەتە هۆی سکاڵانەکردن.

دەیەم: گەر سکاڵاکە پەیوەندی هەبوو بە تاوانێکی سەرپێچی کردن، سکاڵاکە وەرناگیرێت گەر سەرپێچییەکە یەك ساڵی بەسەرداچوو بێت لە تاوانی نەوجەوانان (الاحداث).

یازدەم: سکاڵا لە تاوانەکانی تاوانکارییەکان (جنایات) وەرناگیرێت، گەر ماوەی دە ساڵ بەسەر تاوانەکە ڕەت بوویێت لە تاوانەکانی نەوجەوانان.

دوازدەم: سکاڵا لە تاوانەکانی لاساری (الجنح)ی لەلایەن نەوجەوانان کراوە وەرناگیرێت گەر سێ ساڵی بەسەرداچوو بێت لەکاتی پێزانینی لەلایەن تاوانبەرانبەر کراوەوە.

سێزدەم: سکاڵاکار ڕازی بێت بە گەڕانەوە بۆ جووت بوون لەگەڵ هاوسەری زیناکار، پێش دەرچوونی بڕیاری کۆتایی لە داواکە.

## ٧- سکاڵا بۆ کێ پێشکەش دەکرێت؟

بۆ بیرهێنانەوە، لە وێستگە یاساییەکاندا، پێش داوای سکاڵاو گیروگرفت و چارەکردن و ئامادەگیی بۆ بەردەوام بوون تیایداو پێناسەو شوێنی سکاڵاکردن و حاڵەتەکانی وەرنەگرتنی سکاڵا باسکران، ئامانج لەم زانیارییانەش سەرکەوتن بوو بۆ شەمەندەفەری سکاڵاکردن لە وێستگە یاساییەکانیدا، و نەهێشتنی لێڵی و هاندانی سکاڵاکار بوو بۆ پەیڕەوکردنی بەرنامەی زانستی شارستانی پێشکەوتوو لە داوای ماف کردن و پێدانی زانیاریی یاسایی زانستی پوخت، بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێت لە گەشتەکەی بەرەو دادپەروەریی و وەرگرتنەوەی مافەکانی و سزادانی تاوانکار.

بە کورتی باسی ئەوە دەکەین سکاڵا پێشکەش دەکرێت بە کێ:

دەکرێ سکاڵای سزایی پێشکەشی ئەم لایەنانە بکرێت:

یەکەم: دادوەری لێکۆڵینەوە.

دووەم: دادوەری دادگەی بەرایی، یا دادوەری سزا.

سێیەم: لێکۆڵەری دادی.

چوارەم: داواکاری گشتی.

پێنجەم: هەر بەرپرسێك لە بنکەی پۆلیس.

شەشەم: هەر کەسێك لە ئەندامانی ڕێکهێنان (ضبط)ی دادوەری.

حەوتەم: دەستەی دەستپاکی.

## ٨- دادوەری لێکۆڵینەوە (قاضي التحقيق)

هێشتا لەبەر دەرگەی دادگە داین پێش چوونە نێو شوورەی بەرزی یاسایی دادگە، و پێش ڕووبەڕووبوونەوەی دادوەری و ڕووبەڕوو زۆرم لەو کەسانە بینی چوونەتە دادگە، بە ئامانجی سکاڵاکردن، سکاڵای فێڵ (کیدی) یا تۆڵە یا پچڕاندنەوەی (إبتزاز) یا بە مەبەستی بەرگری لەخۆکردن، بە ڕێبازی ناڕەواو خراپ، هەندێ جار بۆ داوا بەرزرکردنەوە دژی داوای دیکەی بێ بنچینەی ڕاستی.

لە ژیانمدا کاری شەکەت و ماندووبوونی وەك کاری دادوەری لێکۆڵینەوەم بینیوە، کە دەست بەکار دەبێت و سەدان داوا خوازنامەو بڕیارو ئاگادارکردنەوەی لەبەردەستەو لە نێوەندی ئەم درۆو سوێندی بە درۆو ساختەکاری و بێڕێزی یاساو زێدەڕۆیی و بێڕێزی بەرانبەر چارەنووسیان و چارەنووسی تاکەکانی کۆمەڵگە.

عێراق، بەپێی لێکۆڵینەوە تایبەتمەندەکان پێویستی بە (٣٠٠٠) سێ هەزار دادوەرو داواکاری گشتی هەیە بۆ دەستبەکاربوون.

لە دادگاکان، بەداخەوە تەنیا (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد دادوەر ئەم ئەرکە دەکەن، لە جەنگی هێنانەدی دادپەروەری و لە بارودۆخێکی سەختدا، دادوەری لێکۆڵینەوە، ئەستوون و کۆڵەگەی ئەو ڕەشماڵەیە دادپەروەری لە سێبەری دایەو ستەملێکراوان پەنای بۆ دەبەن، لەمبارەیەوە ئەم قسە نەستەقانە دێنینەوە:

- گەر خەڵك بە ویژدان بان دادوەر ئاسوودە دەبوو.
- ڕای چاکی دادوەر باشترە لە شایەتی دادپەروەر (دروست).
- دادگەی ویژدان بە ئامادەبوونی ویژدانی دادوەر دەبەسترێت.
- ترۆپك (قمة)ی دادوەری، لە ڕوانگەی دادوەر، ترۆپکی ستەمە لە ڕوانگەی تاوانبار (گوناهبار).

- دادوەر خوێنەدکاری یاسایە، کەوا پەڕاوی وەڵامەکانی بەخۆی ڕاست دەکاتەوە.
- دادوەرانم پێبدە دەوڵەتت پێدەبەخشم.
- ئەو کەسەی زۆر فرمێسك لەبەردەم دادوەر دەڕێژێت دەدۆڕێت.
- دادوەری پێوەری چاکەیە لەلای نەتەوەکان و پێوەری مەزنییە تیایدا، سەری بڵندی هەموو نەتەوەیەکی زیندوو و ژیرە.
- هیچ چاکەی مەزن و لۆجیکی وەك دادپەروەری بوونی نییە.
- دواخستنی دادپەروەری ستەمێکی گەورەیە.
- دادپەروەری بە ویژدان، نەك ویژدانی کەسی، ویژدانی هەموو مرۆڤایەتی.
- ڕۆژی دادپەروەری بۆ ستەمکار، زۆر توونـدو سەختترە لە ڕۆژی ستەم لەسەر ستەم لێکراو.
- بنچینەی دادپەروەری نیازپاکییە.
- دادپەروەری ئەو ئامرازەیە، لە ڕێگەیەوە ستەم لە ڕەگ و ڕیشەوە دەردێنن، بنبڕ دەبێت.
- دادپەروەری لەوەدا نییە، داوا لە کەسانی دیکە بکەیت ئەوەی تۆ ئامادە نیت بیکەیت.
- دادپەروەری بە پێداگرتن داوا مەکە، لەبەرئەوەی دەشێ بەشێکیت لێ دەستکەوێت.
- دادپەروەریی توندڕەو، لەزۆر حاڵەتدا ستەمە.
- پادشایەتی تەنیا بە ملکەچی چاك دەبێت، خەڵك تەنیا بە دادپەروەری چاك دەبن.
- دادپەروەری پێویستە ئەو چاوپۆشە لاببات، بۆ ماوەیەك بۆ جیاکردنەوەی نێوان چاکەو خراپە.

هەر لەو ڕۆژی پەیدابوونەوە، کۆمەڵگە مرۆییەکان لە ململانێ و کوشتاردان، بە هۆکاری جیاجیا ماددی و مەعنەوی، هێشتا پێویستی بە کەسانێك هەیە لە ناکۆکییەکانیان دادپەروەریان پێشان بدات، ماف لە بەهۆزی زۆرکارەوە وەرگرێتەوە بۆ بێهێزی ستەملێکراو.

لەژێر ناو و دروشمی جیاجیا وەك دادپەروەری، ماف گەڕاندنەوە، بەزەیی، هاوسۆزی، ئەم چەمکانە (مفاهیم) خەوتن مرۆڤایەتی هەوڵدەدات پێیان بگات و لەسەر ئەم بنچینانە دامەزرێت، ئەگینا نەتەوە بەلاڕێدا دەچێت.

یاسادانەری عێراقی لە سەپاندنی مایەی (١/ أ) لە یاسای بنەماکانی سزایی بەرکار هاتووە: ((لایەنی سکاڵای پێشکەش دەکرێت دادوەری لێکۆڵینەوەیە..)).

کەواتە پەناگەی ڕاستی و ماف و شمشێری دادپەروەری و سینە فرەوانی، کەوا دەرگای والایە بۆ هاواری ستەم لێکراوان و ویژدانی زیندووی شەکەت نابێت و لاگری ناکات و ماف پێشێل ناکات.

دادوەری لێکۆڵینەوە، وەك دادوەرانی دیکەی عێراق، پێویستە خزمەتی یاسایی هەبێت، لە پێنج ساڵ کەمتر نەبێت، دەرچووی ئامۆژگای- پەیمانگەی دادوەری (المعهد القضائي) بێت، هەروەها بە فەرمایشتانە، -مرسوم-ی کۆماری دامەزرابێت و سوێندی یاسایی خواردبێت پێش دەستبەکاربوون لە ئەرکە پیرۆزەکەی. لە هەرێمی کوردستان بۆ ئەوەی لە پمانگای دادوەری وەربگیرێت پێویستە هەشت ساڵ خزمەتی قەزائی هەبێت. پاش وەرگیرانی لە پەیمانگای دادوەری پێویستە دوو ساڵ بخوێنێت لە پەیمانگا پاش تەواوبوونی خوێندن لە پەیمانگا، پاشان فەرمانی دامەزراندن لەلایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەردەچێت، بە مەبەستی دامەزراندن پێش دەست بەکاربوون پێویستە سوێندی یاسایی بخوات لەبەردەم سەرۆکی ئەنجومەنی دادوەری هەرێمی کوردستان.

# لێکۆڵینەوە (التحقيق)



## پێناسەی لێکۆڵینەوە

**لە ڕووی زمانەوانی: گەڕان بەدوای ڕاستی**

**لە ڕووی زاراوەییەوە:** کۆمەڵە ڕێکارێك و ئامرازانی ڕەوان، لێکۆڵەر (المحقق) پەیڕەویان دەکات بۆ گەیشتن بە ڕاستی.

لێکۆڵینەوە بە هەواڵدان (الاخبار) (پێراگەیاندن- الابلاغ) دەستپێدەکات: ئەویش پێشکەشی لایەنە تایبەتمەندەکان دەکرێت، بۆ ئەوەی ئاگادار بکرێنەوە لە ڕوودانی تاوان، کۆتایی دێت بە ڕاپۆرتێکی بە وردەکارییەوە سەبارەت ڕاستی تاوانەکە، لە نێوان هەواڵدان و ڕاپۆرت چەند ڕێکارێك هەن وەك: نۆڕینی (کشف) و پشکنین (تفتيش) و ڕاگرتن (توقيف) و وەڵامپرسی (الاستجواب).. هتد.

## ئامانجی لێکۆڵینەوە:

ئامانجی لێکۆڵینەوەی تاوان، سەلماندنی ڕووداوی تاوانەکەو چۆنەتی ڕوودانی و هۆیەکانییەتی، بۆ ناسینی تاوانکارو دیارکردنی پلەی بەرپرسیارییەتیەکەی.

### ١- سەلماندنی ڕووداوی تاوان:

یەکەم شتی پێویستە لێکۆڵەر بیکات دڵنیابوونە لە بوونی تاوانەکە لە ڕووی ماددیەوە، واتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی تەنی تاوان (جسم الجريمة).

گەر لێکۆڵەر لە تاوانی کوشتنی دەکۆڵێەوە -بە نموونە- پێویستە سەرەتا لەوە دڵنیابێتەوە کوشتن ڕوویداوەو ڕاستی ڕوودانەکە لە ڕووی مادییەوە، ئەویش بە گەڕان بۆ تەرمی تاوان بەرانبەرکراو و بینینی و دڵنیابوون لە کەسایەتییەکەی، تێبینی ئەوەش دەکەین، کەوا نەدۆزینەوەی تەنی تاوان واتای وانییە تاوان ڕووینەداوە.

### ٢- چۆنیەتی تاوانکردن:

هەنگاوی دووەمە دوای دڵنیابوون لە ڕوودانی تاوانەکە لە ڕووی مادییەوە، دەبێ دڵنیابین لە چۆنەتی تاوانکردنەکەو چۆنەتی ڕوودانی، گەڕان و لێکۆڵینەوە بۆ زانینی چۆنیەتی تاوانکردنەکە، دەشێ وردەکاری لەبارەی تایبەتییەکانی تاوانکار (الجاني) بزاندرێت، هەندێ جار لە چۆنیەتییەکە، بەڵگە لەسەر سیفەتەکانی تاوانکار دەردەکەوێت، یا پیشەی، یا پلەی رۆشنبیرییەکەی، وەك: شێوازی دەرگا شکاندن، پیشەی تاوانبار دیاردەکات و نیشان دەدات ئایا تاوانکار دارتاشە، یا ئاسنگەر، یا نەخێر.

### ٣- هۆکاری ڕوودانی تاوانەکە:

هەموو تاوانێك هۆکارێکی هەیە، بەڵکو دەشێ چەندان هۆکار هەبن تاوانبار پاڵبدەن بۆ تاوانکردن، ئەم هۆکارانەش بەپێی تاکەکان جیاوازن، هەر تاکەکەسێك ئامادەگی و وازو حەزو سروشت و رۆشنبیریی و ڕوانینێکی هەیە بۆ ژیانی تایبەت بە خۆی، دۆزینەوەی هۆکارە ڕاستەقینەکانی هاندەری تاوانبار بوون بۆ تاوانکردن، دەشێ یارمەتی ناسینی کەسی تاوانکار بدات.

### ٤- ناسینی تاوانکار:

سەلماندنی ڕوودانی تاوان و چۆنیەتی ڕوودانی و هۆیەکەی، دەشێ یارمەتی لێکۆڵەر بدات بۆ ناسینی کەسایەتی تاوانکار، لێکۆڵەر، لە دوای کۆکردنەوەی ئەم ڕێکارانە، پێویستە وردبین بێت لە لێکۆڵینەوە بۆ ئەوەی نەوەکا بێ تاوانێك بکەوێتە تۆڕی تۆمەتبارکردن، لەبەرئەوەی ئامانجی لێکۆڵینەوە تەنیا تۆمەتبارکردنی تاوانکار نییە، بەڵکو دوورخستنەوەی تۆمەتە لە بێ تاوانەکانیش.

# لێکۆڵەر



وشەی لێکۆڵەر بۆ یەکەمجار کەوتە یاسادانانی عێراقی لە یاسای بنجی دادگاییە سزاییەکانی بەغدادی ژمارە (٤٢)ی ساڵی ١٩٣١ لە بڕگەکانی ٢ و ٣دا لە مادەی پێنجەم لە هەمان یاسادا.

## لێکۆڵەر:

ئەو فەرمانبەرەیە لێکۆڵینەوە لە هەموو جۆرە تاوانەکان دەکات بۆ سەلماندنی ڕاستیی ڕوودانی تاوان و چۆنەتی ئەنجامدانی و ڕادەی پەیوەندیی تۆمەتبار بە تاوانەکە.

بەپێی ماددەی (٥١) بڕگە (ھ) لە یاسای بنەماکانی دادگایکردنی سزاییی ژمارە (٢٣) ساڵی ١٩٧١ لێکۆڵەر لە عێراق لەلایەن وەزیری داد دادەمەزرێت، بە مەرجی ئەوەی خاوەن بڕوانامەی یاسا بێت، هەروەها وەزیر دەتوانێت ئەم دەستەڵاتە بداتە ئەفسەری پۆلیس و ڕێپێدراوی پۆلیس و فەرمانبەرانی وەزارەتی داد، ئەوانەی بڕوانامەیان لە یاسادا هەیە بەڵام (ئەوەی ئێستا کاری پێدەکرێت ئەوەیە، لێکۆڵەری دادی یان لێکۆڵەری دادگایی ناتوانێت هەڵبستێت بە کاری لێکۆڵینەوە پاش ئەوە سوێندی یاسایی دەخوات لەبەردەم سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەکە ئینجا دەتوانین کاری لێکۆڵینەوە لەلایەن سەرۆکی ئەنجوومەنی دادوەری دادەمەزرێت).

زانایانی تاوانناسی ڕێککەوتن کەوا پێویستە ئەم تایبەتمەندییانە لە لێکۆڵەر هەبێت، بۆ یە دابەش دەبێت بۆ سەر سێ لایەنی سەرەکی:

## تایبەتمەندییەکانی لێکۆڵەر

لە یاسای بنەماکانی دادگایکردنی عێراقی ئاماژە بە خەسڵەتەکانی یان تایبەتمەندییەکانی لێکۆڵەر نەکردوە بەڵام لەبەر ئەوەی کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ڕەوتی لێکۆڵینەوە و ئاسایشی کۆمەڵگا هەیە. بۆیە پێویستە ئەم تایبەمەندیانەی خوارەوە هەبێت:

١- **تێبینی کردنی بەهێز بێت:** لێکۆڵەر پێویستە خاوەن خێرازانین و دڵنیابوون بێت لە وردەکاریی شتەکانی ڕوودەدەن و بەرهەستن- یا توانستی تێگەیشتنی هەبێت لە کاروبارەکان هەرچەند ورد بن و هەرچەند بۆ یەکەمجار بێ بەها دەرکەون.

٢- **بیرهاتنەوەی بەهێز بێت:** واتە توانای وەرگرتن و داکردنی زانیاری و بینراو و ئەزموونەکانی ڕوودەدەن و یەکێك لە هەستەکان هەستی پێدەکات بپارێزێت، بەهێزیی بیرهاتنەوە زۆر گرنگە لە بەهێزیی تێبینی کەمتر نییە

بۆ لێکۆڵەرە لەبەرئەوەی تا ڕادەییێکی زۆر ئەرکەکەی ئاسان دەکات واتە لەم ڕێگەیەوە دەکرێ ڕووداوەکان بەیەك ببەسترێنەوە.

هەروەها بەهێزیی بیردان (بیرهاتنەوە) یارمەتیدەرە بۆ زانینی جیاوازی و فرەجۆری نێوان شایەتی دانی شایەتەکان ئەوانەی یارمەتی لێکۆڵینەوەکە دەدەن.

٣- **خێرا یادگری (سرعة الخاطر):** واتە بیری مرۆڤ بە ئاگا بێت و خێرا پێبزانێت، کەچی لە دەورووبەری ڕوودەدات و چی دێتە ڕێی لە ڕووداو و باشی ڕەفتار بکات و بەپێی پێویست کاردانەوەی هەبێت و لەکاتی ڕوودانیدا.



٤- **دادپەروەری:** ئەو ئامانجەی لێکۆڵەر هەوڵی بۆ دەدات، گەیشتنە بە زانینی ڕاستی لەو ڕووداوەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات، ئەم ئامانجەش وا پێویست دەکات پابەند بێت، بە ڕێگای بێلایەنیی تەواو بێ ئەوەی لایەنگری لایەنی تۆمەتبار کردن، یا بەرگری بکات.

٥- **ڕێزگرتن لە ئازادیی بەرگریکردن:** واتە لێکۆڵەر دەبێت گوێ لە وتەو بەرگری تۆمەتبار بگرێت و بە سینە فرەوانییەوە، هەروەها گوێ بۆشایەتەکانی نەفی- نەهێشتن (نەسەلماندن) وتوێژ (ینـاقش) لەسەر قسەکانیان بکات بە یەکسانی لەگەڵ شایەتەکانی سەلماندن.

٦- **وردیی لە کارکردندا:** لێکۆڵەر لەسەریەتی بایەخ بە وردترین وردەکاری بدات و پاژە (جزء)کانی، و تەنیا بە ڕواڵەت وازنەهێنێت، بۆ ئەمەش پێویستە لێکۆڵەر لە دروستیی (صحة) قسەکانی تۆمەتبارو تاوانبەرانبەرکراو و شایەتەکان بکۆڵێتەوە، ئەویش بە پشکنین و ئەزموونی پێویست لە شوێنی تاوانکردنەکە.

٧- **ئازایەتی و پشت بەخۆبەستن:** ئازایەتی، ئەو حاڵەتە دەروونییەیە وادەکات خاوەنەکەی بتوانێت ڕووبەڕووی مەترسییەکانی ببێتەوە، بێ ترس، واتە لێکۆڵەر پێویستە ئازا بێت (ماددی و ئەدەبی- گوزارەیی- مەعنەوی)، لەبەرئەوەی ئەرەکی ئەوە شوینە دوورو لابەلاکان بەسەر کاتەوە.

ئازایەتی ئەدەبی- گوزارەیی، ئەویش پێویستە لەبەرئەوەی یارمەتی دەدات لە لێکۆڵینەوە لە دژی کەسانێك خاوەن سامان و دەستەڵات، یا ئەوانەی دەستەڵاتیان جێی مەترسییە لە پاشەڕۆژدا.

٨- **چالاکی و مکوڕبوون-الجد:** چالاکی و ڕشت و مکوڕبوون لەکاردا لە سیفەتەکە بنەڕەتییەکانە، کەوا پێویستە لێکۆڵەر هەیبێت، ئەویش پێویست دەکات لە لێکۆڵینەوە خێرا بێت و سستی نەنوێنێت و دوای بخات و

یەکسەر بچێتە شوێنی ڕووداوەکە، لەبەرئەوەی نیشانەکانی تاوان بە ڕەتبوونی کات نامێنێت، یا بەهۆی تاوانبارەوە، یا بەهۆی سروشتەوە.

٩- **خۆڕاگری و بەردەوامی:** پێویستە لێکۆڵەر توانای بەرگەی ماندووبوون و شەکەتی بگرێت بێ بێزاربوون یا نارەزایی، یا نائومێد بێت گەر ئەنجامی ئەرێنی دەست نەکەون لە لێکۆڵینەوەکانی بەرایی، بەڵکو دەبێ بەردەوام بێت و سوور بێت لەسەر لێکۆڵینەوە تا دەگاتە ڕاستی.

١٠- **نهێنی پارێز بێت:** پێویستە لێکۆڵەر نهێنی پارێز بێت، شت نەدرکێنێت، ئەو زانیارییانە بشارێتەوە کەوا لەبەرژەوەندی دا نییە کەس لێیان ئاگادار بێت، لەبەرئەوەی نهێنی درکاندن دەشێ ببێتە هۆی شکستهێنانی لێکۆڵینەوەکە.

# زانیارییەکانی لێکۆڵەر

هیچ لێکۆڵەرێك ناتوانێت کارەکەی بە ڕێکی و تەواوی بکات، مەگەر هەندێ زانیاری هەبێت، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی پتەوی بە لێکۆڵینەوەی تاوانکارییەوە هەیە، لە گرنگترین ئەم زانیارییانەش:

## ١- زانینی یاساکان:

یەکەم شتی پێویستە لێکۆڵەر بیزانێت یاساکانە، بەتایبەتی یاسای تاوانکاری، لەبەرئەوەی یارمەتی دەدات بۆ جیاکردنەوەی کارە قەدەغەکراوەکان (تاوان) و کارە ڕێپێدراوەکان، سەرەڕای ئەوەی زانینی یاساکانی یارمەتی دەدات ڕێگای ڕاست هەڵبژێرێت، هەر لە سەرەتاو یەکەم ترووکەی هەواڵدان لەبارەی تاوانەکە تا گەیشتنە بڕیاری یەکلاکەرەوە لەسەر تاوانەکە.

## ٢- پزیشکیی داد (ڕەوا- شەرعی):

پێویستە لێکۆڵەر زانیاری تەواو هەبێت لە بواری پزیشکیی داد، ئەوەی لە مردن و نیشانەو هۆکارەکان و گۆڕانەکانی لە تەرم ڕوودەدەن و جۆرەکانی برینی و ئامرازەکانی بەکارهاتوو دەکۆڵێتەوە، هەروەها زانینی پزیشکی داد لەلایەن لێکۆڵەرەوە یارمەتی دەدات بۆ خوێندنەوەی ڕاپۆرتە پزیشکییەکانی لە پزیشکی دادەوە دێن، لەبەرئەوەی هەندێ زاراوە- (مصطلح)ی تیایە مرۆی ئاسایی نایزانێت.

## ٣- شێوازی تاوانکردن:

ئەو شێوازەی تاوانبار پەیڕەوی دەکات لە ئەنجامدانی تاوانەکەی جۆرێك تایبەتمەندیی خۆی تێدایە، مەگەر بە ناچاری دەنا نایگۆڕێت، هەروەها

ئەزموونەکان پێمان دەڵێن، هەتا ئەو ئامێرەی بەکاری دێنن لە تاوانکردندا کەم وادەبێت بیگۆڕن، هەمان ئامێر بەکاردێنن.

## ٤- دەروونزانیی تاوانکاری (علم النفس الجنائی):

دەروونزانیی تاوانکاری، ئەو زانستەیە ڕەفتاری تاوانکاری دەکۆڵێتەوە، هەروەها لە هاندەرو هەست و نەستی تاوانکار، ئەم زانیارییانەی ئەو زانستەی گرنگی زۆری هەیە، بۆ لێکۆڵەر وادەکات شارەزایی و لێهاتویی پەیدا بکات بۆ ئەنجامدانی کارەکەی بە ڕێك و پێکی.

## ٥- فریاگوزاریی بەرایی (الاسعافات الاولیة):

زۆرجاران لێکۆڵەر یەکەم کەسە دەگاتە شوێنی تاوانکردنەکە، دەشێ لەوێ بەرکەوتە (مصاب) هەبن، پێویستیان بە فریاکەوتن هەبێت، کەواتە لێکۆڵەر گەر بزانێت چۆن فریاگوزاریی سەرەتای بکات زۆر کەس ڕزگار دەکات و دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئازارەکانیان، سەرەڕای لایەنی مرۆیی (إنسانی)، ئەم فریاکەوتنە یارمەتی دەدات لێکۆڵینەوە بکات لە ڕێی بەرکەوتووان و زانیارییان لەبارەی تاوانەکە.

## ٦- رۆشنبیریی گشتی:

پێویستە لێکۆڵەر خاوەن رۆشنبیریی گشتی بێت، کەوا لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب و گۆڤارەکان پەیدا دەبێت، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە زانستی تاوانکاری و کۆمەڵایەتی و لێکۆڵینەوە لە تاوان وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و بەدوای هۆکارەکانی دەگەڕێت.

## ٧- زمانە بیانییەکان و شێوەزارە (لهجة) خۆجێیەکان (محلي):

لێکۆڵەر لەبەر فرمانەکەی پێویستی بە لێکتێگەیشتنە لەگەڵ کەسی تاوان بەرانبەرکراو و شایەت، گەر یەکێکیان بیانی بوو پێویستە بە زمانی ئەو لەگەڵی بدوێت و بەلای کەم زمانی بیانی باو وەك ئینگلیزی و فەرەنسی بزانێت.

## ٨- زانیاری گشتی:

لە کاروبارەکانی دیکەی پێویستە لێکۆڵەر بیانزانێت، بەکارهێنانی چەك، مەلەوانی زانین، ئۆتۆمبێل هاژۆتن و هەر شتیکی دیکەی کارەکەی ئاسان بکات.

# بەڵگە سزاییەکان (الادلة الجزائية)



**بەڵگە سزاییەکان:** سەلماندنی بە تاوانباردانانی تۆمەتبارە، یا بێبەری کردنی لە تۆمەتەکەی خراوەتەپاڵی، ئەوەشیان پێویست دەکات پشت بە بەڵگەی وا ببەستێت دادوەر دڵنیا بکات بە بە تاوانباردانا، یا بێ تاوان دانانی تۆمەتبار، بەهۆی کاریگەری بەڵگەکان لەسەر ویژدانی و بەڵگە بە سادەیی هەموو شتێکە ببێتە هۆی دەرخستنی ڕاستییەکان.

یاسادانەری عێراقی بەڵگە سزاییەکانی دیاری نەکردووە، وەك دیاریکردنی بەڵگە شارستانییەکان، ئەویش بەهۆی ئەوەی یاسادانەری عێراقی نەیویستووە بەڵگە سزاییەکان سنووردار بکات بە دەقی وا شێوەیێکی تایبەتی هەبێت وەك بەڵگە شارستانییەکان وەك: (بەڵگەی نووسراو و دانپێدانانی (إقرار) و سوێند خواردن).

ئەوەیش لەبەرئەوەی تاوانبار هەموو فێڵێک دەکات بۆ نەهێشتنی هەموو شوێنەوارێك بۆ بەڵگەی پێشوەخت دەیانزانێت.




## بەشەکانی بەڵگەسزاییەکان (ماددی و بابەتی)

### ١- ماددی:

ئەو بەڵگانەن، کەوا دەکرێ دەستیان لێبدەین، یا بیانبینین، لەم جۆرە بەڵگانەش هەبوونی شتە دزراوەکان لای تاوانکار یا تاوانکار گرتن لەوکاتەیدا ئەو چەکەی پێبێت کە تاوانەکەی پێکراوە، ئەم بەڵگانەش بەم رێکارانەی لێکۆڵینەوە پەیدا دەکرێن:

أ- **پشکنین و گەڕان لەشوێنی تاوانکردن.**

ب- **پشکنین.**

ج- سوودوەرگرتن لە شارەزایان لە پزیشکانی دادو تایبەتمەندانی دیکە.

## ٢- بەڵگە گوزارەیی و کەسییەکان (الادلة المعنوية والشخصية):

ئەو بەڵگانەن، کەوا دەگەنە لێکۆڵەر لەسەر زمانی کەسانی دیکە وەك دانپێدانانی تۆمەتبارو شایەتی شایەتەکانی

نەرێکار (نفي) و سەلماندن (الاثبات).

### بە هاوگرنگی بەڵگە ماددی و گوزارەییەکانی لێکۆڵینەوە:

بیروڕاکانی زانایانی لێکۆڵینەوەی تاوانکاری ناکۆکن سەبارەت گرنگی بەڵگەی ماددی و مەعنەوی.

هەندێ دەڵێن بەڵگەی ماددی بنچینەییە لە سەلماندن، بەڵام بەڵگەی گوزارەیی ناکرێ زۆر پشتی پێببەستین، لەبەرئەوەی تۆمەتبارو شایەتەکان، شیاوی بەدرۆخستنەوە یا بە ڕاست دانانن، کەچی بوونی پەنجەمۆری تۆمەتبار لە شوێنی تاوانکردندا، یا بوونی شتە دزراوەکان لای یا تۆمەتبار، یا دەستگیرکردن و ئەو خوینی پێوە بێت و چەکی بە دەستەوە بێت، هەموو ئەم بەڵگانە بە درۆ ناخرێتەوە، لایەنی دووەم بۆ ئەوە دەچن بەڵگەی ماددی هەندێ جار ڕاست ناکەن واتە ناکرێ پشتیان پێ ببەستین بە ڕەهایی، دەشێ بکوژ قەوانی بەتاڵ (ظرف فارغ)ی تازە تەقێندراو بخاتە شوێنەکە جیاواز لە جۆری چەکی بەکاری هێناوە لە تاوانکردندا.

## ٣- بەڵگە ڕاستەوخۆکان (الادلة المباشرة):

ئەم بەڵگانەن ڕاستەوخۆ پەیوەندی نێوان تۆمەتبارو تاوانەکە پێشان دەدەن، ئەم بەڵگانەش، یا ماددین، یا گوزارەیی- معنوی، هەبوونی شتە دزراوەکان لەلای تۆمەتبار، بەڵگەی ماددیی ڕاستەوخۆیە، شایەتی دانی شایەتەکانی ئەوانەی ئامادەی ڕوودانی تاوانەکە بوون، بە یەکێك لە پێنج هەستەوەرەکانیان، ئاگایان لێ بووە، بەڵگەی گوزارەیی (معنوی) ڕاستەوخۆن.

**٤- بەڵگە ناڕاستەوخۆکان (الادلة غير المباشرة):**

کۆمەڵە ڕاستییەکن هەموویان پەیوەستن بە ڕووداوێکی دیاریکراو، لەم ڕاستیانەوە زنجیرەیێک بارودۆخ دروست دەبن دەشێ بە بەڵگەی سەلماندنی ئەو ڕووداوە بژمێردرێن، دەشێ ماددی یا مەعنەوی بن، دۆزینەوەی ئامرازی تاوان لە شوێنی تاوانکردنەکەو لە دەست تۆمەتبارو جلوبەرگی بەخوێن بن لە هەمان گرووپی خۆی، نموونەیەکە بۆ بەڵگەی ماددی ناڕاستەوخۆ، لەبەرئەوەی ئەم شتە بەشێوەیەکی بنبڕ پەیوەندی تۆمەتبار بە ڕووداوەکە ناسەلمێنێت.

بەڵگە ڕاستەوخۆکانی گوزارەیی- مەعنەوی لەوە دەردەکەون، لە شایەتی دانی ئەوانەی تۆمەتباریان بینیوە هەڕەشەی کوشتن لە تاوان بەرانبەرکراو دەکات، واتە شایەتی دانی بیستەنی (سماعی).

# هەواڵدان



ئاگادارکردنەوەی دەستەڵاتدارانی تایبەتمەندە سەبارەت ڕوودانی تاوانێک، یاسای تاوانکاری (جنائی)، بە دەق (نص) باسی کردووە.

هەواڵدان دەشێ نووسراو بێت یا زارەکی (شفهی) لەوکاتەیدا زارەکی (شفوی) بێت، پێویستە لێکۆڵەر قسەکانی هەواڵدەر (المخبر) بنووسێتەوەو خۆی و هەواڵدەر واژۆی بکەن، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە، گەر هەواڵدانەکە درۆ بوو.

## چۆنیەتی ڕەفتارکردنی لێکۆڵەر لەکاتی هەواڵداندا

لەوکاتەی لێکۆڵەر هەواڵی سەبارەت تاوان پێدەگات، پێویستە بزانێت ڕێکەوتی (تاریخ)ی ڕوودانی تاوانەکەی بووە، بۆ ئەوەی بزانێت ئەوکاتەی بەسەر تاوانەکەدا ڕەت بووە، پێش هەواڵدان، هەروەها ئایا شوێنەوار (أثر)ی مادی ماوە؟ هاوکات پێویستە بچێتە شوێنی ڕووداوەکە بۆ ئەوەی بزانێت پلەی بایەخدانی هەواڵدەر چەندە؟ لەبەرئەوەی دەشێ دواخستنی هەواڵدان فێڵ بێت بۆ یاری کردن بێت بە

بەڵگەکان و هەڵبەستن (تلفیق)ی درۆ بێت بۆ ئەوەی یاریدەی بکەر بدرێت ئادگارە (معالم)ـەکانی تاوانەکەی بشارێتەوە. دوای دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی هەواڵدانەکە یەکسەر دەچێتە شوێنی ڕووداوەکە.

## جۆرەکانی هەواڵدەران (أنواع المخبرين)

١- هەواڵدەر لە هەواڵەکەیدا کەسێك تۆمەتبار بکات بە تاوانکردن دژی تاوان بەرانبەرکراو لەوکاتەدا **(هەواڵدەر لەبارەی کەسی دیکە- (مخبر عن الغير).**

لەم حاڵەتەدا هەواڵدانی ڕاستەقینەیە، یا بە نیازپاکی کراوە، وەك: لەکاتی شەڕی نێوان چەند کەسێکدا، تاوانێك دەکرێت، نیازپاکی کەسێك وادەکات هەواڵ بدات کەوا تاوانکار کەسێکی دیاری کراوە، کەچی لە ڕاستیدا تاوانکار کەسێك دیکەیە، کەسی ئامادەبوو وەك شایەت ئامادە دەبێت و چی دەزانێت سەبارەت ڕووداوەکە باسی دەکات، هەندێ جار دەشێ هەواڵدەر کەسێکی دیکە تۆمەتبار بکات، هەرچەند باوەڕی وایە بێ تاوانە، دەشێ هاندەری ڕك و کینەو ئێرەیی (الحقد والكراهيه والغيره) وا بکەن بە تۆمەتباری دابنێت.

٢- **هەواڵدەر خۆی تۆمەتبار بکات**، وەك ئەوەی لە هەواڵدانەکەیدا بڵێت ئەو تاوانیکی بەرانبەر کەسێك کردووە، لەبەرئەوەی تاوانی بەرانبەر کەسی سێیەم کردووە، لەوکاتەدا خۆی هەواڵ لەخۆی دەدات.

ئەم حاڵەتەش هۆکاری دەروونی، یا هۆشەکی کۆنی هەیە، هەرچەند بێ تاوان بێت بۆ ئەوەی هەست بە گوناح کردنی نەمێنێت، یا حەزی دەرکەوتنی ڕازی بکات، یا ئەم کردارە بکات بۆ ئەوەی کەسانی دیکە لەو تۆمەتە ڕزگار بکات.

چی بۆ پاراستنیان، یا بەرانبەر پارە (دەسکەوتی ماددی) یا گوزارەیی (معنوی).

**٣- هەواڵدەر خۆی و کەسێکی دیکە تۆمەتبار بکات بە تاوانکردن دژی کەسی سێیەم**، بەمجۆرە هەواڵدەر، هەواڵ لە خۆی و لە کەسی دیکە دەدا بەیەکەوە.

دەشێ هەندێ کەس، بۆ تۆڵەسەندنەوەو ڕك و کینەی دەروونیان، هەواڵی درۆ بدەن و دەشی پشتگیری هەواڵەکەیان بکەن وەك ڕاستی دەرکەوێت بەوەی خۆیان بە هاوبەشی بەرپرسیارێتی دابنێن لەگەڵ هەواڵ لەبارەوە دراو، لێرەدا لێکۆڵەر پێویستە زۆر وریا بێت، پێویستە بە لێکۆڵینەوە لە ڕەوشتی هەواڵدەرو باری دەروونی و ڕابردووی و لێکۆڵینەوە لە کێشەکە بگاتە ڕاستییەکان، بە کورتی: گەر کەسێك لەخۆڕا هەواڵی دا بە لێکۆڵەر سەبارەت ڕووداوێك و بارودۆخی بەهێز نەبوو و بەڵگەی ماددی نەبوو پشتگیری بکات، دەبێ لێکۆڵەر لەباری دەروونی کەسەکەی هەواڵدەرە بکۆڵێتەوە تا ڕاستی بابەتەکە بزانێت.

# نۆڕین لە شوێنی ڕووداوەکە

# (كشف في محل الحادث)



سەیرکردنی شوێنی تاوانکردنەکەیەو بینینی حاڵەتی تاوانبەرانبەر کراوەو حاڵەتی تۆمەتبارە گەر گیرا بێت، باسی هەموو ئەم لایەنانە بە وردی و گشتگر نۆڕینییە لە شوێنی ڕووداو.

## گرنگی نۆڕینی (اهمية الكشف)

بە گرنگترین ڕێکارە ڕاستەقینەکان دەژمێردرێت و بە پلەی یەکەم دێت لەنێو ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە، بەهۆی ئەوەی:

١- بە وردی و گشتگیرو ڕاست باسی ڕووداوی تاوانەکە دەکات.

٢- وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرا بە لێکۆڵەر دەبەخشێت، سەبارەت شوێنی تاوان و سەپاندنی و، یا نەرێ کردنی و چۆنەتی ئەنجامدانی و چی پەیوەندی بەوەوە هەیە لە شوێنەواری ئاشکرا سەبارەت تاوانکار، یا تاوانکاران.

## ڕێسا گشتییەکانی نۆڕینی

لێکۆڵەر پێویستە پەیڕەوی ئەمەی خوارەوە بکات:

### ١- خێرا نۆڕینی بکات:

نۆڕینی تەنیا بە (ڕاستەوخۆ و خێرا) چوونە شوێنی تاوان دەکرێت

بۆ ئەوەی پاشماوەکانی ڕووداوەکە جێگیر بکات، لەبەرئەوەی ڕۆڵی گەورەی هەیە لە سەرکەوتنی لێکۆڵینەوە، گەر دواکەوت، ئەوا دەبێتە هۆی ون بوونی ئادگارەکانی تاوان (معالم الجريمة)، چی بەهۆی هۆکاری سروشتی، وەك باو باران و بەفرو شتی دیکە، یا لەلایەن کەسانی دیکەوە.

### ٢- یەدەککارییەکانی نۆڕینی (احتياطيات الكشف):

لێکۆڵەر پێویستە یەدەککارییەکانی پێویست بکات بۆ پاراستنی شوێنی ڕووداوەکە، وەك چۆن تاوانکار جێی هێشتووە، لەم یەدەککاریانەش گەیشتنی لێکۆڵەرە بۆ شوێنی ڕووداوەکەو شتەکان وەك خۆیان بپارێزێت و لەوەش بکۆڵێتەوە کە دەسکاری کردووە.

بۆ نموونە: گەر تەرمەکە لە شوێنی خۆی گوێزرابووەوە، دەبێ لەوە بپێچێتەوە بۆ گوێزراوەتەوەو حاڵەتی بەرایی و ڕاستەقینەی چۆن بووە لە شوێنی تەرمەکەو ڕێکاری پێویست پەیڕەو بکات بۆ ئەو مەبەستە.

### ٣- وەسفکردن:

لێکۆڵەر کە دەگاتە شوێنی ڕووداوەکە پێویستە بە وردی و گشتگر وەسفی شوێنەکە بکات، بەمشێوەیە:

**أ- بە نووسین باسکردن:** بە نووسین باسی شوێنی ڕووداوەکە کردن کۆنترین شێوازو باشترینیانە بە ڕوونی باسی شوێنی ڕووداوەکە دەکات و پێویستە لە دەستەواژە (عبارة)ی لێڵ و نامۆ دووركەوێتەوە، بە شتە گشتییەکان دەستپێ بکات و بێتە سەر وردەکارییەکان، لە هەمانکات هەموو شوێنەوارو شتەکان باس بکات، هەرچەند گرنگیش نەبن، لەبەرئەوەی دەشێ ببنە کلیلی دۆزینەوەی ڕاستی تاوانەکە.

**ب- وێنەی بەرخۆر:** ئەوەیان وەسفی بە نووسین تەواوتر دەکات، وەك: پێکدادانی ئۆتۆمبێلان و ئاگرکەوتنەوە تەنیا باس کردن بەس نییە پێویستە وێنەی بگیرێت (واتە وێنەی شوێنی ڕووداوەکە- شانۆی تاوانەکە، وەك چۆن ڕوویداوە).

**ت- نیگاری ئەندازەیی (الرسم الهندسي):** باس کردنە بە نووسین و وێنەی فۆتۆگرافی، ئەمەیان بەتایبەتی گرنگە لە ڕووداوی پێکدادانی ئۆتۆمۆبێلان، یا ئاگرکەوتنەوە، یا کوشتن، یا دزی، زۆرجاران بڕیاری دادوەر لەسەر نیگاری ئەندازەیی وەستاوە، لە ڕووداوی هاتوچۆ، لەبەرئەوەی بە وردی حاڵەتی ڕێگاکەو درێژی و پانی و وەستانەکان و ئاڕاستەکان و دووری ئۆتۆمۆبێلەکان لە یەکتر پێشان دەدات و شوێنی پەرتبوونی جامی شکاو پێشان دەدات.. هتد. لێکۆڵەر لەسەریەتی یەکسەر بچێتە شوێنی ڕووداوەکە، ڕاستەوخۆ دوای هەوڵدان، پێش ئەوەی ئادگارەکان- معالم- تێك بچن.

## ٤- ئەنجامگری (الاستنتاج) و بەڵگەهێنانەوە (الاستدلال):

لێکۆڵەر تەنیا بە وەسف، یا وێنەگرتن، یا نیگاری ئەندازەیی وازناهێنێت، بەڵکو پێویستە لە تەك ئەمانەدا، چی ئەنجامگری کردووە لە کرداری نۆڕینییەکەو لە کۆنووس (**محضر**)دا بینووسێت، ئایا تاوانبار چۆن هاتووەو چۆن تاوانەکەی کردووەو چۆن دەرچووە، هاوکات ڕای خۆی بڵێت، پێویستە لێکۆڵەر لە شوێنی ڕووداوەکە کۆنووس ئامادە بکات، لەبەرئەوەی لە شوێنی دیکە شتی لەبیر دەچێت، کە بیاننووسێت و پەیوەست بە تاوانەکە یا بکەر، هەرچەند بچووك بن، بەڵام ئەنجامیان گرنگترن، دەشێ زۆر بە سوود بن لە لێکۆڵینەوەدا.

# بابەتی نۆڕینی

# (موضوع الكشف)



نۆڕینی ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرێت:

## یەکەم: جێگیرکردنی شوێنی ڕوودانی تاوانەکە:

### ١- جێگیرکردنی حاڵەتی شوێنی وێنەگیراو:

**أ- سەلماندنی حاڵەتی تاوان کردن لە دەرەوە:** لێکۆڵەر، کە دەگاتە شوێنی ڕوودانی تاوانەکە، کاتی گەیشتنی و ناوی کەسانی لەگەڵیدان تۆمار دەکات و باسی شوێنەکە دەکات وەك لە دەرەوە ڕا دیارە، شوین و سنوور و ڕێگاکانی دەرووبەری و شوورەو باخچەو خانووەکان باس دەکات.

ب- **جێگیرکردنی حاڵەتی ڕوودانی تاوانەکە لە ناوەوە:** دوای دڵنیابوون لە جێگیرکردنی حاڵەتی ڕوودانی تاوانەکە لە دەرەوە، لێکۆڵەر بڕیار دەدات لە ناوەوەڕا جێگیری بکات، بە وەسفکردنێکی وردو گشتی، بۆ نموونە: ژوورەکان، هۆڵەکان، پاشکۆی دیکە (المرافق الاخرى)، شوێن و چی تیایە تۆمار دەکات، هەروەها چی تیا دەدۆزێتەوە لە شوونەواری تاوانکار جیی هێشتووە، وەك ئامێرو پێڵاو و چەك و کلیلەکان و شتی دیکەو ئەو گۆڕانەی تیای ڕوویداوە بە نووسینی تایبەتییەکانیان.

ت- **جێگیرکردنی بەشێك لە شوێنەکەی تاوانی تیادا کراوە:** دوای جێگیرکردنی شوێنەکە لە دەرەوەو لە ناوەوە، دەچێتە شوێنی تاوانەکەی تیا ڕوویداوە، لە ڕووی مادییەوە، ژوورەکەی تەرمەکەی تیا دۆزراوەتەوەو پارەی تیا دزراوە، یا ئاگری تێبەردراوە.

## جێگیرکردنی حاڵەتی شوێنی بێ شووره:

چۆڵایی و باخچەو شوێنی گشتی:

أ- شوێنی جێیەکە بەگوێرەی چوار لایەنە لە بنجیەکە بەگوێرەی نزیکترین شوێنی پۆلیس.

ب- باسی حاڵەتی زەوی ئایا کشتوکاڵییە چێندراوە یا نا، جۆری ڕووەکەکان و دارە شکاوەکان و ئەوانەی دیکەو چۆن تێکشکاوە.

ت- باسی ئەو شوێنەوارانەی تاوانکار لە شوێنی ڕووداوەکە جێی هێشتوون وەك شوێن پێ و شوێنی سمی ئەسپ و وڵاغ.

ث- دیارکردنی ئەو ڕێگایەی تاوانبار لێی هاتۆتە ژوورو لێی چووەتەدەرو چی بەکارهێناوە لە هاتوچۆ، ئۆتۆمۆبێل و یا باربەر، یا بەپێ ڕۆیشتووە.

ج- بە وردی باسی لەشی تەرمەکە بکرێت.

## دووەم: جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەر کراو:

تاوانبەرانبەرکراو یا مردووە، یا زیندووە، لە هەردوو حاڵەتدا پێویستە حاڵەتەکەی جێگیر بکرێت لە ترسی ڕزینی تەرمەکەو نەمانی ئادگاری تاوان یا چاکبوونەوەی برین لەباری تاوانی ئازاردانی.

### ١- جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەرکراو لەباری مردندا:

أ- پێویستە حاڵەتی شوێنی تەرمەکەی لێ دۆزراوەتەوە بە وردی تۆمار بکرێت.

ب- باسی سروشتی تەرمەکەو دیارکردنی ئەو کەسانەی دۆزیویانەتەوەو چییان لێ کردووە، لە ڕووی گواستنەوەی بۆ شوێنی دیکەو هۆی گواستنەوەی.

ت- باسی تەرمەکە لە ڕووی ڕەگەز (نێر، یا مێ یەو تەمەنی بە مەزەندەم، درێژی و نیشانەی بەرچاو، شوێنەوار، وەك برین و لەکە.

ث- جلوبەرگ پشکنین و باسکردنیان و دیارکردنی دڕان یا نەمانی دوگمەیێك و باسی گیرفان و چی تیایە لە نووسراو، یا پارە.

ج- دیارکردنی هۆی مردن.

ح- چی لە دەورووبەری تەرمەکە هەیە لە چەك و ئامێرو کەلوپەل و پۆشاك و شوونەواری پێڵاو و هەر شتێك ناسنامەی تەرمەکە دیار بکات گەر نەناسراو بوو.

### جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەرکراو گەر زیندوو بوو:

تاوانبەرانبەرکراو بە وردی بپشکندرێت و باسی ئەوە بکرێت ڕووشان و برین و شینهەڵگەڕانی هەیە، یا پێك، شێرەو ڕادەی دیار بکرێت و کاتی ڕووشانی و ئامێری پێی کراوە، ئایا تاوانبەرانبەرکراو دەیتوانی وابکات یا نا.

## سێیەم: جێگیرکردنی حاڵەتی تۆمەتبار

پێویستە لێکۆڵەر جەستەی تۆمەتبار بپشکنێت و ئەوە دیار بکات لەسەر ڕووی و هەردوو دەستی و ئەندامەکانی دیکەیدا چی هەیە، لە ڕووشان (خدوش) و شینەهەڵگەڕان-کوتراو (کدمات) و برین و شوونەواری ددانی لە بەرگری دەستدرێژکارەوە پەیدابووبن، هەروەها جلوبەرگی بپشکنێت بە ڕووی بوونی پێك و پەڵەو دڕاوی و هۆی بوونیان و کاتی ڕوودانیان و بەستنەوەیان بە کاتی ڕووداوەکە یا، نا.

### ئەوەی نۆڕینی دەیگەیەنێت:

لە نۆڕینی شوێنی تاوانکردن چەندان کاروبار دەخوێندرێتەوە، چی ئەوانەی پەیوەستن بە تاوانکردنەکە، یا تاوانکار (تاوانبار).

**یەکەم/ نۆڕینی ئەوەی دەگەیەنێت سەبارەت تاوانەکە، ئەم کاروبارانەیە:**

١- **بوونی تاوان:** ئەو کارە دەخاتەڕوو کەوا تاوانی پێکهێناوە، وەك: بینینی ئاگرکەوتنەوە، یا تاوانی کوشتن.

٢- **چۆنەتی تاوانکردنەکە:** وەك: شکانی دەرگا، یا کون لە دیوارکراوی، هێمایە بۆ تاوانکردنەکە لەم ڕێگەیەوە.

٣- **شوێنی تاوانکردنەکە:** دۆزینەوەی تەرمەکە لە ژووری ماڵەکە، یا خوێنی دەورووبەری ئاماژەیە بۆ تاوانەکە، لەم ژوورەدا، بەڵام لەباری دۆزینەوەی تەرمەکە بە سەربڕاوی و نەبوونی خوێن لەم شوینە واتای وایە کوشتنەکە لە شوێنی دیکە کراوەو گوێزراوەتەوە ئێرە.

٤- **کاتی تاوانکردن:** لێکۆڵەر بە سەیرکردنی تەرمەکەو زانینی کاتی مردنی، یا کاتی برینداربوون و بەرکەوتنەکانی دیکە لە ڕێی ڕەنگیان و گۆڕانیان، دەتوانێت کاتی تاوانەکە بزانێت.

٥- **ئامرازی تاوانکردن:** لە تۆڕینییەوە دەردەکەوێت چی ئامرازێك لە تاوانەکە بەکارهاتووەو جۆری چییە (چەکی ئاگری، مەکینەکانی ساختەکردن.. هتد).

٦- ڕێگاهاتنەژوورەوەو چوونە دەرەوەی تاوانکار: ئەمەیان لە ئاڕاستەی شوونەواری پێیەکان و هێڵی ڕۆیینی دەردەکەوێت، چۆن هاتوچۆی کردووە لە شوێنی تاوانەکە.

٧- **هۆی تاوانەکە:** لە تۆڕینیدا هۆی تاوانەکە دەردەکەوێت، گەر کەلوپەلی ماڵ پەرت و بڵاوبوون و خەزێنەی پارەی بەتاڵ بوو، واتە تاوانی دزی کراوە، بوونی تەرمی تاوانبەرانبەرکراو و نەبوونی هیچ پەرتوبڵاوی و ونبوونی شتان نیشانەیە بۆ تاوانی کوشتن (بۆ تۆڵە).

**دووەم: تۆڕینی چی دەگەیەنێت بەگوێرەی تاوانبارەوە:**

١- **کەسێتی تاوانبار:** هەبوونی پەنجەمۆری تاوانبار لە شوێنی تاوانەکە، ئاماژەیە بۆ کەسی تاوانبار.

٢- **دابونەریت و سیفەتەکانی تاوانبار،** لەکاتی دۆزینەوەی پاشماوەی جگەرە ئاماژەیە بەوەی ئاڵودەی جگەرەکێشانە، یا دەشێ لە شوێنی پێی (پێڵاوەکان) بزانرێت ئایا شەلە یا نا، یا بەژن درێژە یا نا.

٣- **پیشەی تاوانبار:** گەر دەرگەی خاووەکەی دزی لێکراو کراوە بوو، هونەرییانەی ڕێك پیشەی تاوانکار پێشان دەدات کەوا دارتاشە، ئا ئاسنگەر.

٤- **تاوانکار شارەزایی شوێنی تاوانە:** دزینی بڕە پارەیێك لە چەکمەچەیێکی دۆڵابێك بێ ئەوەی شتەکانی دیکە پەرت و بڵاوبینەوە، واتە تاوانکار پێشتر شارەزای ئەم شوێنە بووە پێش دزینەکە، ئەمەیش لێکۆڵینەوەکە تەرخان دەکات بە کەسانێکی دیاری کراوەوە.

٥- **تاوانکار تاوانبەرانبەر کراو بناسێت:** گەر لە ڕووداوەکە شوێنەوار دەرکەوت، تاوانبار خۆی گۆڕیوە تا نەناسرێتەوە، تا لە لێکۆڵینەوە دەرکەوت، تاوانبار شێوەی گۆڕیوە یا سەرو سیمای، یا لە دواوە لە تاوانبەرکراوەکەی داوە تە نەیبینێت، تا نەیناسێت.

٦- **ژمارەی تاوانکاران:** ژمارەی جێ پێی زۆر، یا پەنجەمۆری جیاوازی زۆر، یا حاڵەتی شتە دزراوەکە، یا قەبارەی، یا کێشی یا ژمارەی بەرکەوتنەکان لە تاوانبەرانبەرکراو ئاماژەن بۆ زۆری تاوانکاران.

## نۆڕینیی هێمایی (کشف الدلالة)

تۆمەتباربردنە شوێنی تاوانەکە، لەلایەن لێکۆڵەرەوە بۆ بینینی چۆنەتی تاوانکردن بە وردەکارییەوە بۆ دڵنیابوون لە وتەکانی.

**ئەم کردەوەیە کەی دەکرێت؟**

دوای نۆڕینی و داننانی تۆمەتبار بە تاوانەکە، دەشێ داننانی تۆمەتبار هۆکاری زۆر بێت هانیداوە بۆ دانپێدانانی بە درۆ وەك هاوبەش کردنی هاوتاکەی، یا لادانی تۆمەت لەسەر کەسێکی دیکە، یا خۆدەرخستن، پێویستە لێکۆڵەر بە وریاییەوە سەیری دانپێدانی تۆمەتبار بکات و لە دروستی و ڕاستی دڵنیابێتەوە، نۆڕینیی هێمایی شێوازێکی ئەم کارەیە.

## مەرجەکانی نۆڕین بەهۆی تۆمەتبار:

دوو مەرجی بنەڕەتی هەن پێویستە لە نۆڕینیی هێماییدا هەبن.

١- تۆمەتبار حاڵەتی شوێنی ڕووداوەکە نەزانێت، پێش تاوانکردنەکە، بەشێوەیەکی بنبڕ ناکرێ دڵنیابین لە دروستی وتەکانی تۆمەتبار بەگوێرەی شوێنێك حاڵەت و سروشتی شوێنەکە پێشوەخت بزانێت.

٢- دەستپێشخەری لە ئاڕاستەکردن لە ڕێکارەکانی نوێڕینیی هێمایی بەدەست تۆمەتبارە، ئەوە دەبێت ڕوونی کاتەوە لەکوێوە هاتووەتە ژوورو لە کوێ چۆتە دەرەوەو شوێنی تاوانەکە کوییەو چۆن تاوانەکەی کردووە؟ ڕۆڵی لێکۆڵەر تەنیا، داوای ڕوونکردنەوەو پرس و گوێگرتنە بۆ تۆمەتبار، ئەوەشیان بە ماقولی، دەنا واتای وایە ئەوە تۆمەتبار ئاڕاستە دەکات ڕاستەوخۆ، یا ناڕاستەوخۆ، سەرباری ئەوەش وردەکاریی ڕووداوەکان بەتایبەتی گرنگەکانیان زۆربەی جاران دەکەونە نێو خەڵك و دەگوازرێنەوە.

## حاڵەتی فرە تۆمەتباران لە یەك ڕووداودا:

کۆنووسی نوێڕینی بۆ هەریەك لەو تۆمەتبارانە دەکرێتەوە، تۆمەتباری سەرەکی باس دەکرێت و ڕۆڵی هاوبەشەکانی، بە مەرجی چوونە شوێنی ڕووداوەکە، هەریەك بە تەنیا بێت، نەوەك پێگوتن (تلقین)ی بە کۆمەڵ ڕوویدات.

دوای تەواوبوونی ڕۆڵی تاکەکەس مۆر دەکرێت و تەواو دەکرێت و کۆنووسێکی بە کۆمەڵ دەکرێتەوە بە ئامادەبوونی هەموو تۆمەتباران لە شوێنی ڕووداوەکەو هەریەکەیان ڕۆڵی خۆی باس دەکات و کۆنووس دەنووسرێت لە وتەی تۆمەتباران بە شێوازی ڕاناوی نەهاتوو (ئەو وای وت).

## حاڵەتی فرە شوێنی ڕووداوەکە:

وەك ئەوەی کەسێك یەکێك بکوژێت لە شوێنێك و تەرمەکەی بباتە شوێنێکی دیکەو بیشارێتەوە، لەو حاڵەتەدا پێویستە نوێڕینیی هێمایی بە ژمارەی شوێنەکان بکرێت و بە تەنیا بۆ هەر شوێنێك و بۆ یەکەکەی تۆمەتباران.

# ڕێکخستنی هێلکاری شوێنی ڕووداوە

# (تنظيم مرتسم للمحل الحادث)

## نیگاردۆزیی هێلکاری (المرتسم المخطط):

نیگارێکی روونکەرەوەیە دەکرێت بۆ شوێنی رووداني تاوانەکەو جێ و دوورایيیەکان (مواقع وأبعاد).

هەموو ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە پێیەوە، بۆ ئەوەی بیرۆکەیێکی ئاشکراو ڕاست لەبارەیەوە هەبێت.

بۆ دیارکردنی بەرپرسیاریێتی تاوانکاری، وا باشە وێنەیێکی فۆتۆگرافی بۆ ڕووداوەکە بگرێت سەرەڕای هێلکارییەکە (مخطط)، ئەویش وێنەیێکی ئاشکراو وردەکاری و زیندووی بابەتی تاوانەکە دەبێت، لەبەرئەوەی وێنەی فۆتۆگرافی دیمەنی گشتی دەنوێنێت و لە دیاریکردنی ئاراستەکان و دوورایی و ماوەکانی گرنگی گەورەیان هەیە لە شوێنی دیاریکردنی بەرپرسیارییەتییەکە.

## ڕێسا گشتییەکانی ڕێکخستنی نیگاردۆزی (المرتسم):

١- پێویستە چوار لایەنە بنجیەکە بەگوێرەی شوێنی ڕووداوەکە بە نیگار دیار بکرێت.

٢- یەکخستنی پێوەرەکانی نیگارەکە بۆ ئەوەی جیاوازی پێوانەکە سوودی کارەکە لەناو نەبات، واتە نابێت مەودایەك بەپێ پێوانە بکرێت و ئەوەی دیکە بە بۆسەو مەتر.. هتد.

٣- وردی کردن لە پێوانەو تەنیا پشت بە خۆی ببەستێت لەم کارەدا.

٤- دیاریکردنی پێوەرێکی دیاریکراو بەپێی سروشتی مەوداو شوێن و قەبارەی کاغەزەکەو رادەی وردەکاری کە پێویستە نیشان بکرێت.

٥- هەموو ئەوەی پەیوەندی شوێنی تاوانەکەوە نییە لە هێلکارییەکە لادەبردرێت.

٦- نیگاری هێلکارییەکە لە شوێنی تاوانەکە بکرێت و پشت بە توانای بیرکەوتنەوە نەبەسترێت لە چاککردنەوەی هەڵەکان لە نیگارەکەدا دوای دوورکەوتنەوە لە شوێنی ڕووداوەکە.

٧- نیگار پێوانەکەی دیار دەکات.

٨- هێلکارییەکە لەسەر کاغەزێکی بەکارهاتوو لە کۆنووسی نۆڕینی دەکرێت، گەر شوێنەکە لە دوو نهۆم پێکهاتبوو، هەر نهۆمێك نیگارێکی بۆ دەکرێت.

٩- لە خوارەوەی کاغەزەکە هێمای ڕوونکەرەوە بەکاردەهێندرێت وەك پیت و ژمارەی دیار یا بە نووسین، وەك: تەرم ژمارە (١) یا (پیت) (م) و پنکی خوێن ژمارە (٢) پیت (ب).

١٠- هەر هێلکارییەك ناونیشانێکی هەیە دەبێ دیار بێت، ناو ناوچەی نیگارکێشراو و شوێن و ڕێکەوتی و کاتی ڕێکخستنی لەسەر نووسرابێت، ناوەڕۆکی نیگاردۆزییەکە (مرتسم).

أ- شوێنی تاوانەکە: واتە نیگاری دیمەنی شوێنی تاوانکردنەکەو دەوروبەری لە خانووە ڕێگای بۆی دێن.

ب- شوێنی تاوان: نیگارکێشانی ئەو خاڵەی تاوانەکەی تیا ڕوویداوەو ناوەڕۆکەکەی و شوێنی دۆزینەوەی تەرمەکە، واتە دوای ئەوەی لێکۆڵەر هێڵکارییێکی گشتی بۆ شوێنی ڕووداوەکە دەکات و شوێنی تاوانەکە دیار دەکات تیایدا، لەگەڵ دیوارەکان و پەنجەرەکان و دەرگاکان، دواتر چی لەناو ژوورەکە هەبووە وەك تەخت و دۆڵاب و نیگاری شوێنەوارەکان لە

شوێنی خۆیان وەك پنكی خوێن و قەوانی بەتاڵ لەگەڵ دوورابیان بەگوێرەی چی لە ژوورەکە دایەو جەستەی (تەنی) تاوانەکە.

ج- جەستەی تاوانەکە: لە دواکایە نیگاری جەستەی تاوانەکە دێت لە شوێنی لێی بووەو ئاماژە بە شوێنی بنەڕەتی دەکرێت گەر تەرمەکە گوێزرابووەوە، یا دۆلابە ئاسنینەکە گوێزرابۆوە، هەروەها چی لەسەرەیا لە دەورووبەرە لە شوێنەوارە جیاجیاکان دیاری دەکرێت.

دائرة المحقق العدلي في مركز شرطة.........................

التاريخ: / /

الساعة:




**توقيع**

**المحقق العدلي**

**اسم**

مركز الكشف والمخطط على محل الحادث
شرطة (      )
٢٠/ ٩/ ١٩٩٧

من خلال الإنتقال الى محل حادث غرق المجنى عليه(      )
وبصحبة خبير الطبعة الجرمية شاهدت ما يلي :
١- إن محل الحادث يبعد حوالي ٧ سبعة كيلومترات عن مركز الشرطة
٢- إن محل الحادث يقع شمال غرب مركز الشرطة .
٣- كان الوقت هو الساعة الخامسة عصراً والجو صحواً والرؤية واضحة تماماً .
٤- إن محل الحادث عبارة عن نهر مائي بعرض ٢٥ متر وبعمق ٤ متر تقريباً مملوء بالماء يسمى بـ (نهر البستان ) يتجه جريانه من جهة الشمال باتجاه الجنوب وتسمى المنطقة بمنطقة بساتين الركة .
٥- وجود جثة الغريق المجنى عليه (      ) طافية على سطح الماء على جهة الوجه وهو مفارق للحياة تماماً لغرقـــــه .
٦- وجود آثار إطارات عجلة مطبوعة على التراب على ضفة النهر ويتضح ان الاطارات شبه مستهلكة تقريباً ويتضح أيضاً أن سائق العجلة قد استدار في المكان وعاد أدراجه نحو القرية كما هو واضح من خلال ملاحظة آثار الاطارات .
٧- تم انتشال الجثة على ضفة النهر ونقلها الى دائرة الطبابة العدلية في بعقوبة لمعرفة سبب الوفاة الحقيقي .
٨- لم أجد أي شيء آخر يستفاد منه في خدمة التحقيق .

م . أول
(      )
ضابط التحقيق


ملحق للكشف والمخطط لمحل حادث غرق المجني عليه ( ) ص ٢٤
جثة المجني عليه
اتجاه جريان ماء النهر
عرض ٢٥م
طريق ترابي
المسافة ٧ كيلومتر
شارع عام
شمال
غرب
جنوب
شرق
POLICE
شرطة

# دووبارەکردنەوەی پێکهاتەی ڕووداو

مەبەست لە دووبارەکردنەوەی پێکهاتەی ڕووداو بە یەکبەستنەوەی ڕووداوەکانی تاوانە وە گەڕان لەسەر بازنە وونبووەکانە کە گومان دروست ئەکەن، یاخود ڕۆیشتنی شوێنەوارەکانی تاوانە یاخود ئەو پاشماوانەی کە تاوانبار جێی هێشتوون یاخود یەکنەگرتنەوەی ووتەکانیەتی لەکاتی هەوڵدانی نکۆڵیکردنی لە ئەنجامنەدانی تاوانەکە وە. وە ئەم کارەش بە دوو ڕێگا ئەکرێت:

١-هێنانی تاوانبار کە نکۆڵیٚ ئەکات لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە بۆ شانۆی تاوان وە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت، تێبینی کراوە کە ئەو ڕێگایە کاریگەری دروست ئەکات لەسەر نەفسیەتی تاوانبار وا ئەکات دان بە کردنی تاوانەکە بینیٚ.

٢-شارەزابوون لەسەر ڕێگای ئەنجامدانی تاوان وە ئاشکرابوونی هەنگاوە یەک بەدوای یەکەکانەوە کە گرتوویەتیە بەر لەکاتی ئەنجامدانی، تاوانبار هەوڵ ئەدات لەسەر شاردنەوە و سڕینەوەی شوێنەواری ئەو تاوانەی کە کردوویەتی، تەواو نابێت تەنها لە ڕێگای دەسکەوتنی ئەوەی کۆیکردۆتەوە لە کارە سەرەکییەکان بۆ پێکهێنانی زنجیرەیەک بەو شێوەیەی کە تاوانەکە ڕوویداوە، بۆ ئەوەی ببێتە وێنەیەکی نزیک لە ڕاستی.

## گەڕانەوەی تاوانبار بۆ شوێنی تاوان

تێبینی کراوە لە تاقیکردنەوە درێژەکانی لێکۆڵێنەوە کەوا هێندێک لە تاوانباران بەتایبەتی ئەو ت اوانبارانەی یەکەمجار تاوان ئەکەن دوای ئەنجامدانی تاوانەکەیان ئەویش لەسەر پلەیەک نیشانکراو لە گەورەیەوە وەک کوشتن بۆ نموونە

ئەگەڕێنەوە بۆ شوێنی ئەنجامدانی تاوانەکە لە دوای ڕۆژێک یا دوو ڕۆژ یاخود بە کەمێک زیاتر زۆر جاران تاوانبار بە دوای جەنازەی ئەو کەسەش ئەڕوات کە کوشتەی دەستی خۆیەتی ڕەنگە لەهەموو ئەوانەش ناڵەو فیغانی زیاتر بێت.

زانایانی بواری زانستی دەروونزانی تاوانکاری ئەو دیاردە نەفسیە شیئەکەنەوە: کەوا مرۆڤ لەگەڵ ململانێی ناو بەدەنی خۆدی خۆی ئەژی ئەو ململانێیەش کۆتایی دێت بە گونجاوی دائەنێ کەوا کردنی هەڵسوکەوتی ناکۆمەڵەیەتی (دڕندەیی) لە هەموویدا دەورە ئەدرێت لە ژێر تێگەیشتنی تاوان بە تێگەیشتنێکی یاسایی ئەویش ئەو کاتەی هێزی پاڵنەر دەبێتە (غەریز-دوژمنایەتی) توونـد و تیتـریەک لە هێـزی کپکـراو (ئەخلاقـی -کـۆمەڵایەتی) لە زۆربەی کاتـدا ئەدرەوشێتەوە ئاکامەکەشی بۆ ئەو تاوانە بە هەستکردن بە پەشیمانبوونەوەیەک دەکات.

## ناسینەوەی بەهۆی سەگی پۆلیس

سەگی پۆلیسی لەهەموو گیانەوەران جیائەکرێتەوە بە هێزی ئەو (حاسە) هەستە بۆنکردنەوەی هەیەتی، هەڵسەنگاندنێک لە ڕێژەی بەکارهێنانی سەگ بۆ ئەو حاسەیە١٠٠% بوو، کاتێ کە سەگی پۆلیسی دێنی بۆ ئەو شوێنەی کە تاوانی تیا ئەنجامدراوە ئەو کاتە بەدوای ئەو بۆنەی تاوانبار ئەکەوێ کە لە شوێنی تاوانەکە بە هەوادا بڵاوبۆتەوە یاخود نووساوە بەو شتانەی دەستی لێداوە، یاخود بە عەرزەکە نووساوە لە ڕێگای رووتی پێیەکانی، لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێک لەگەڵ مرۆڤێکیتر بە جل و بەرگ و بەشتەکانیتر ئەنووسێ کە دەست لە هەر بەشێک لەو جەستەیە بدرێت، وە پەیوەندی بە عەرزەکە هەیە کە مرۆڤ لەسەر ئەڕوات هەر کە با هەڵبکات بڵاوئەبێتەوە، بەو جۆرە سەگەکە بۆن ئەکات بە دوای خاوەنەکەی ئەڕوات.

وە تێبینی ئەکرێت کەوا هەستی بۆنکردن لەلای سەگ تێک ئەچێ بە گەرماو شێ و وە بە بارودۆخی تەندروستی هەروەها مانەوەی بۆنەکانی لە شوێنی خۆی بۆ ماوەیەکی زۆر ئەوەش ئەوەستێت لەسەر کاریگەری بارودۆخی ئەو کەش و هەوایەی دەورەی شوێنەکەی داوە وە ئاراستەی بایەکەش ڕۆڵی خۆی ئەبینێت.

## کاری سەگی پۆلیسی:

سەگی پۆلیسی بەکاردێت بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارانەی خوارەوە:

١-بەدوا گەڕان و چاودێری بەدوای هەڵاتووەکان ئەکات ئەوانەی تاوانی کوشتن و دزین و قاچاغیان ئەنجامداوە ئەویش دوای ئەوەی سەگەکە بۆنی ئەو پاشماوەی بە بۆنکراوە، وە ئەو بۆنەش بەو ناوە بڵاوبۆتەوە.

٢-گەڕان بەدوای پارەی دزراو وە ناسینی ئەو شوێنەی کەلێی شاردراوەتەوە، ئەو کاتە سەگەکە بۆنی ئەو بۆنە ئەکات کە توانبار لە شوێنی ڕووداوەکەی جێهێشتووە جا بەو شیوەیە بەدوای ئەو بۆنە ئەکەوێت تا ئەگات بەو شوێنەی تاوانبار پارە و پولەکەی لی شاردۆتەوە.

٣-ناسینەوەی.

٤-پاسەوانیکردنی کەسەکان وماڵەکان و گارکەکان: بۆ ڕێکاریەکانی ئەو کردەوەش لە پێناو دەستنیشانکردنی تاوانبار ئەیهێنی بەو پاشماوانەی تاوانبار جێیهێشتووە لە شوێنی تاوانەکە، ئەو سەگە لەو شوێنە بەرەڵلا ئەکرێت تا تەواو لە بۆنەکە دڵنیا بێت، لە دوایدا تاوانبار دائەنێت لە نێوان هەشت کەسیتر بە شێوەیەک یەک بەدوای یەک وە لەنێوان هەر یەکێکیشیان هەنگاوێک ماوە هەبێت، پاشان سەگەکە بە نێوانیاندا ئەڕوات بۆ ناسینەوەی خاوەنی ئەو بۆنەی سەگەکە لە شوێنی تاوانەکە بۆنی کردووە، لێکۆڵەر بەر لەوەی کردەوەی ناسینەوەی تۆمەتبار بکات سەگەکەی تاقی ئەکاتەوە.

## ئەرکەکانی لێکۆڵەر لە بەکارهێنانی سەگی پۆلیسی:

١-پارێزگاریکردنی شتەکان بە شێوەیەکی محەکەم بۆ نیشاندانی بە سەگی پۆلیسی.

٢-هاوکاریکردن لەگەڵ ڕاهێنەری سەگەکە وە دەورەدانسی، بۆ زانین بە بارودۆخی تاوانەکە بۆ ئاڕاستەکردنی سەگەکە بەپێی نەخشە داڕێژراوەکە.

٣-دەبێت پارێزگاریکردنی هەموو شتەکان هەریەکەو بە جیا بێت، وە ئەگەر دوو مادده تێکەڵ بە یەک بن ئەو کاتە پەیوەندی بە دوو کەسی جیا جیا نەبێت، پاشانیش کاری سەگەکە تێک ئەدات.

٤-دواخستنی کاری پسپۆرە هونەریەکان، وەک پسپۆڕەکانی پەنجەمۆرو پێ و ئەوانیتر لە چارەسەرکردنی شوێنەوارەکان بەو پێوداویستیە هونەریانە تا ئەو کاتەی بۆنی ئەکات لەلایەن سەگەکە ئەویش بۆ ئەوە تا بۆنەکانیان تێکەڵ بە بۆنی تاوانبار نەبێت.

٥-پارێزگاریکردن لە سەر شوێنەوارە جێگیرکراوەکان وە داپۆشینی بە جوانی تا ئەو کاتەی سەگی پۆلیسی ئامادە ئەکرێت.

٦-ڕێکخستنی کۆنووسەکانی لێکۆڵینەوە بۆ کردوەی ناسینەوەی لە سەر تۆمەتبار یاخود چاوگێڕان لە پاشماوەی تاوان و تاوانبار لەلایەن سەگی پۆلیسی، وە واژۆکردنی لەلایەن لێکۆڵەر و ڕاهێنەری سەگەکەو دوو شاهێد.





# هەڵکەندنی گۆڕو نۆڕین لەسەر لاشە

# فتح القبر والكشف على الجثة

یاسای سزادانی عێراقی سزای داناوە لە ماددەی (٣٧٣) ڕاستکراوە بە بەندەکردن نابێت لە دوو ساڵ زیاتر بێت وە بە غەرامەکردن نابێت لە (؟) دینار زیاتر بێت بە یەکێک لەو دوو سزایە ئەو کەسە سزا ئەدرێت هەر کەسێک هەڵسێ بە حورمەت شاکاندنی یا پیسکردنی گۆڕێک یا گۆڕستانێک یاخود پەیکەری مردووێک یاخود تێکدان یا زیانگەیاندن یا شێواندنی شتێک لەو بارەیەوە.

وە سزای داناوە لە ماددەی (٣٧٤)ی ڕاستکراوە لە هەمان یاسا بە بەندکردن نابێت لە دوو ساڵ زیاتر بێت وە بە غەرامەکردن نابێت لە (؟) دینار یاخود بە یەکێک لەو دوو سزایە هەر کەسێک هەڵسێ بە حورمەت شکاندنی تەرمێک بە ئەنقەست یاخود بەشێکی یاخود ناوزڕاندنی ئەو کاتە سزا ئەدرێت بە بەندکردنی لەسێ ساڵ زیاتر نەبێت.

مەبەست لە ئەو دەقە یاساییە ئەوەیە دڵنیابوونە لە ڕاست و ڕەوای پێویستی حورمەتی مردوو و گۆڕەکانیان، بەڵام زۆر جاران وا پێویست دەکات لە هۆیەکانی بە هەڵکەندنەوەی گۆڕ و نۆڕین لەسەر تەرمەکە لە پێناو گەیشتن بە ڕاستیەکان، بۆیە دەرئەکەوێت کەوا یاسا داڕێژەری عێراقی ڕێگەی داوە لە مادەی (٧١) لە یاسای شێوازی دادگایی سزایی بە دادوەری لێکۆڵینەوە دەسەڵاتی ڕێپێدان، ئەگەر ئەو حاڵەتە پێویست بکات بە گۆڕهەڵکەندن بۆ نۆڕین لەسەر تەرمی مردوو بەهۆی

پسپۆڕ یاخود دکتۆری تایبەتمەند بە ئامادەبوونی هەر کەسێک لە کەس و کاری ئەوانیە پەیوەندییان هەیە کەوا بزانن لە هۆی مردنی.

وە پێیی مادەی (٧١)بۆ ئەوەی بتوانرێ لە هەڵکەندنی گۆڕ و پێویستە ئەو مەرجانەی تیا بێت:

١- دەبێت ڕەزامەندنی دادوەری لێکۆڵینەوە وەربگیرێت.

لێرەدا بۆ (لیکۆڵەر- داواکاری گشتی- پزیشکی دادوەری) بۆیان نیە بەبێ ڕەزامەندنی دادوەری لێکۆڵینەوە هەڵسن بە هەڵکەندنی گۆڕ بۆ نۆڕین لەسەر تەرمی مردوو بۆ دادگا هەیە کەوا فەرمان بدات بە هەڵکەندنی گۆڕ بۆ نۆڕین لەسەر تەرم بەو ئیعتیبارەی کەوا هەڵکەندنی ئەنجامدانی ڕێکارییەکانی ل لێکۆڵینەوەیە (مادده ٣٦١ شێوازی سزادان).

٢- هەڵکەندنی گۆڕ ئەکرێت بۆ نۆڕین لەسەر تەرمی مردوو بە هۆی پسپۆڕ یاخود پزیشکی تایبەتمەن، لێرەد نە بۆ (لێکۆڵەر و خودی دادوەری لێکۆڵینەوە) نیە بۆ خۆیان هەڵسن بە هەڵکەندنی گۆڕی تەرمی مردوو.

٣- دەبێت هۆیەک هەبێت کەوا پێویست بکات بە هەڵکەندنی گۆڕ تاوەکو لەسەر ئەنجامدانی ئەو ڕێگایە بگەن بە ڕاستیەکان.

٤- پێویستە هەر کەسێک لەوانەی پەیوەندیان هەیە ئامادەبن، لێرەدا ئەتوانرێ ئەو ئەنجامدانە بکرێت بە پاشملەیی ئەوانەی تایبەمەندن ئەگەر ئارەزوویان نەبوو ئامادەبن لەسەر هەڵکەندنی گۆڕ، هەروا تێبینی ئەکرێت کەوا زۆر حاڵەت هەیە هەڵکەندنی گۆڕەکان دەگەڕێتەوەبۆ شاردنەوەی هۆی مردنی ڕاستەقینە یاخود هەڵەی هونەری کەوا دکتۆری شەرعی تیای ئەکەوێ، وە دادوەری لێکۆڵینەوە ئەیدۆزێتەوە یاخود دادگای تایبەتمەند.

لێرەدا ئەوەی پێشوو باسمانکردن مەرجی یاساین، لەبەر ئەوەی کەوا کردەوەی هەڵکەندنی گۆڕ سەرەڕای ئەوەش کە پێویست ئەکات ڕێکارییەکانی تایبەتمەندی لێکۆڵینەوەن:

١- دڵنیابوون کەوا ئەو گۆڕە بۆ تەرمی ئەو کەسەیە کە لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەکرێت لەلایەن کەس و کاری مردووەکە یاخود دوو شاهێد کە توانای سەلماندنیان هەبیت.

٢- دکتۆر یاخود پسپۆڕ فەرمان ئەدات بە ناردنی تەرمەکە بۆ پەیمانگای پزیشکی دادوەری بۆ ئەنجامدانی هەڵدڕینی تەرمەکە وە هەڵسان بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی تاقیگەیی یاخود پزیشکی پێویست یاخود زۆر جاران بۆ پزیشک ئەوەندە بەسە بە وەرگرتنی بەشێک یاخود چەند بەشێک لە تەرمەکە بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی تاقیگەیی لەسەری.

٣- دووبارە شاردنەوەی تەرمەکە دوای ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی پزیشکی.

٤- ڕێکخستنی کۆنووسێکی تایبەت



# پشکنین- التفتیش



گەڕانە لە تەنی تاوان- جسم الجریمة، و ئامرازی بەکارهاتوو لە تاوانکردن و هەموو ئەوەی پەیوەندی پێیەوە هەیە یا بە کردارەکە، ئەوەی لە بەرژەوەندیی تاوانکارە بیشارێتەوە، وەك: شاردنەوەی ماڵی دزراو، یا جلوبەرگی خوێناوی.. هتد.

## ڕێسا گشتییەکانی پشکنین:

### ١- خێرا چوونە شوێنی پشکنینەکە:

پێویستە لێکۆڵەر خێرا بچێتە شوێنی تاوان، لەبەرئەوەی تاوانکار زۆربەی جاران هەوڵی شاردنەوەی ئادگارەکانی تاوان دەدات، هەروەها شاردنەوەی هەر شوێنەوارێك هێما بێت بۆی بەتایبەتی تاوانی سێکسی (زایەندی)، جۆرە پێشبڕکێیەك هەیە لە نێوان لێکۆڵەرو تاوانبار، هەرچەند لێکۆڵەر زوو بچێت بۆ شوێنی تاوان دەتوانێت دەرفەت نەدات بە تاوانبار.

## ٢- یەدەککاری پشکنین:

پێویستە لێکۆڵەر پێش دەستکردن بە پشکنین و لەکاتی پشکنین ڕێکارە یەدەککارییەکان پەیڕەو بکات کەوا ببێتە هۆی ئەوەی بۆی دەگەڕێت ون نەبێت، ئەویش لە ڕێگەی:

أ- کردەی پشکنین بە نهێنی تەواو بکرێت.

ب- دەورەدانی شوێنی پشکنین بۆ ئەوەی ڕێنەدرێت هیچ شتێك ببرێتە دەرەوە.

ت- هەموو کەسێك ڕێنەدرێت بێن یا بچتە دەرەوەی لە شوێنی پشتکین.

ث- گلدانەوەی کەسەکان لە یەك شوێن بۆ پشکنین.

## ٣- ڕیزبەندیی لە پشکنین:




دوای جێبەجێکردنی خاڵە بەراییەکان لە پشکنین، لێکۆڵەر دەست بە لێکۆڵینەوە دەکات لە: خاڵێك و هەر بەویش کۆتایی دێنێت، بەشێوەیێك هەموو شتێك بگرێتەوەو هەموو شوێنەکە بگرێتەوە، لە پشکنینی خانوو بە نهۆمی خوارەوە دەستپێ دەکات

دواتر دەچێتە نهۆمی سەرەوە، پشکنینی کەسەکان، لە نهۆمی سەرەوەڕا دەستپێ دەکات تا نهۆمی خوارەوە، هەروەها جلوبەرگی ناوەوە پێش دەرەوە.. هتد.

**٤- وردیی تێبینی کردن:**

پێویستە لێکۆڵەر بەهێز بێت لە تێبینی کردن، لەکاتی پشکنین، دەبێت بڕوانێتە هەموو شتێك بە وردی و چاودێری کەسانی دەوروبەری بکات نەوەك یەکێك شتێك بخاتە شوێنەکە بۆ تۆمەت هەڵبەستن بۆ نەیارێکی خۆی.

**٥- دووبارەکردنەوەی پشکنین:**

زۆر جاران تاوانبار دوای ئەوەی دەزانێت شوێنێك پشکنراوە، شتەکانی تاوانباری خۆی دەباتە ئەو شوێنە بۆ شاردنەوەی، گوایە جارێکی دیکە ناپشکندرێت، بۆیە دەبێ لێکۆڵەر دیسان ئەو شوێنە بپشکنێت بۆ دڵنیابوون.

**٦- ئەنجامی پشکنین:**

**ئەنجامی پشکنین لەم دوو حاڵەتە دەرناچێت:**

أ- لێکۆڵەر ئەو شتەی پشکنینی بۆ دەکات بیدۆزێتەوە، یا ئەوەی دەبێت گلی داتەوە، بۆیە دەبێت کۆنووسی بۆ بکات تیایدا ڕێکارەکانی دیار بکات و کاتی پشکنین و شوێن و شتەکانی دەستیان بەسەردا گیراوە.

ب- لە پشکنینەکە هیچی دەست نەکەوێت، یا بکرێ دەستی بەسەردا بگرێت، لەم حاڵەتەدا کۆنووسێك دەنووسێت و تیایدا ئاماژە بەوە دەکات هیچی نەدۆزیوەتەوە.

لە هەردوو حاڵەتدا، لەسەر داواکاری تۆمەتبار و لایەنی پەیوەندیدار، دانەیێك لە کۆنووسەکەیان دەداتێ.

## پشکنینی شوێنەکان:

شوێنەکان، یا ئەوەتا گشتین، وەك: شانۆ و سینەماکان.. هتد. یا تایبەتن، وەك: ماڵ و کۆگاو نووسینگە.. هتد. پشکنینی شوێنە گشتییەکان پێویستی بە مۆڵەتی دادوەری لێکۆڵینەوە نییە، بەڵام شوێنە تایبەتییەکان پێویستی بە مۆڵەتی دادوەری لێکۆڵینەوە هەیە، لێکۆڵەری شوێنە تایبەتییەکان پێویستە بە نهێنی کاربکات نەوەکە هەواڵەکە بگاتەوە تاوانبار و ئینجا دەچێتە شوێنی پشکنینەکەو دوو شایەت لەگەڵ خۆی دەبات، لەگەڵ هەڵبژێردراو، موختاری شوێنەکە بۆ ئەوەی تانە لە ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە نەدرێت.

کە دەگاتە شوێنەکە پێویستە ڕێکارەکانی ڕێگرتن لە بردنە دەرەوەی شتەکانی بۆ پشکنینیان هاتووە، بگرێتەبەر.

# شایەت و شایەتیدان



شایەتی: بریتیە لە کەسێک کە بە زارو داننانە لەلایەن شایەتەوە سەبارەت هەموو ئەوەی دەیزانێت لەبارەی ئەزموونێك یا ڕووداوێك لە ڕێی هەستەوەرێکییەوە زانیویەتی. بەپێی مادەی (١) لە یاسایی پاراستنی شایەتی عێراقی ژمارە (٥٨)ی ساڵی ٢٠١٧.

شایەتەکان بەگوێرەی بابەتی شایەتییەکە دەکرێتە سێ بەش:

١- **شایەتەکانی سەلماندن:** ئەوانەن شایەتی لەسەر ڕووداوەکان دەدەن ئاماژەن بۆ تاوانێك و دەدرێنە پاڵ تۆمەتبارو سەلماندنی تاوان لەسەری.

٢- **شایەتەکانی بەرگری:** ئەوانەن شایەتییەکانیان ئەو ڕووداوانەی تێدایە تاوانەکە لە تۆمەتبار دووردەخاتەوەو بێتاوانی دەکات.

تێبینی: شایەتی پێویستە سەبارەت بارۆدۆخی تاوانەکە بێت، لەبەرئەوە لە شایەت دەپرسێت چی بینیوە یا بیستووە یا پێی زانیوە.

**٣- شـایەتی پاکانـەکردن (شـهادة التزکیـة)**:گرنگـی شـایەتی: لـە پرسـە تاوانکارییەکانـدا شـایەتی گرنگـی زۆری هەیـە، لـە بەڵگـە گوزارەییـەکان-معنوی دەژمێردرێت، پشتی پێ دەبەسترێت بۆ بڕیاردان لەسەر چارەنووسی تۆمـەتبار، دەشێ شایەتی ژیانی مرۆڤێکی بێتاوان وێران بکات چی بە لە سێدارەدان، یا بەندکردن یا ناوزڕاندنی (تشهیر).

هـەروەها دەشـێ ببێتـە هـۆی ڕزگـارکردن و بێتـاوان پێشـاندانی گوناهبـارێکی شایانی سزا بێت، لەبەرئەوەی شایەت مرۆڤەو زۆر هۆکار کاری تێدەکەن و کار لە دروستی شایەتیەکەی دەکەن چی بە مەبەست یا بێ مەبەست، بۆیە بۆ دەسکەوتنی شـایەتییەکی بابەتیانـە (موضـوعي) پێویسـتمان بـە زۆر خـۆڕاگری و شـارەزایی و تێگەیشتن هەیە لە قووڵایی دەروونی مـرۆڤ، کە هەمیشـە لـە گـۆڕان دایـە بـەپێی بارودۆخی دەورووبەری.

## ڕاسپاردنی شایەت بۆ ئامادەبوون

شایەت لەلایەن لێکۆڵەر بانگ دەکرێت بۆ ئامادەبوون لەکاتی لێکۆڵینەوەدا بە نووسـراوی ڕاسـپاردن (ورقـة تکلیـف) لـە ڕێگـەی پـۆلیس یـا کـارگوزارێکی فەرمانگەی فەرمانی ڕاسپاردنەکەی دەرکردووە یا لە ڕێگەی موختـار یـا کەسێکی دیکەو بەپێی یاسا، دەشێ فەرمانبەران لە ڕێگەی فەرمانگەکانیان داوا بکرێن.

نووسراوی ڕاسپاردن بە دوو دانە دەنووسرێت بەناوی شایەت و ناوبانگی و شوێنی نیشـتەجێ بـوونی و کـات و شـوێنی پێویسـتە لێـی ئامـادە بێـت و جـۆری تـاوانی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت و بەچی یاسایەك، واژۆ یا پەنجەمۆری شایەت لەسەر نووسراوی بنەڕەتی وەردەگیرێت و لەسەری دەنووسرێت پێی ڕاگەیەندراوە.

گەر شایەت نـەخۆش بـوو یـا ڕێگـری هـەبوو لـە ئامـادەبوونی دادگـە یـا لێکۆڵـەر دەچێتە شوێنی نیشتەجێبوونی تا شایەتییەکەی بنووسێت.

دادگە دەتوانێت فەرمانی گرتن بۆ ئەو شایەتە دەربکات کە مەبەست نایەت بۆ شایەتی دان، و بە زۆرەکی بهێندرێت، شایەتی بە مەبەست ئامادە نابێت، سزای بەندکردنە ماوەیەك لە ساڵێك زیاتر نەبێت و پێبژاردن لە سەد دینار زێتر نەبێت.

## ڕیزبەندیی لە گوێگرتن لە شایەتەکان:

بە تۆمارکردنی وتەی سکاڵاکار، یا هەواڵدەر دەست بە لێکۆڵینەوە دەکرێت، دواتر وتەی شایەتەکانی سەلماندن بەپێی گرنگی شایەتیەکەیان و دواتر تۆمەتبارو شایەتەکانی بەرگری.

### ئەوانەی گوێ لە شایەتییان دەگیرێت

هەموو کەسێك نێر یا مێ، گەورە یا بچووك دەکرێ (شایەت) بێت، تێبینی ئەوە دەکرێت ئەوەی تەمەنی لە خوار پازدە ساڵانە، گوێ لە قسەکانی دەگیرێت وەك بەڵگەکاری بێ سوێند دان، ئەوەی پشت بە شایەتییەکەی دەبەسترێت دەبێت: خاوەن توانای هۆشی خۆی بێت و شیاویی لەدەست نەدابێت بۆ شایەتی دان، چی بەهۆی تەمەن، یا حاڵەتی جەستەیی یا هۆش یا دەروونی، دەبێت ئەم حاڵەتانە لە کۆنووسی لێکۆڵینەوە بنووسرێت لەلایەن لێکۆڵەرەوە.

## ڕێسا گشتییەکانی گوێگرتن لە شایەت:

١- ئامادەبوونی شایەت لەبەردەم لێکۆڵەر، تا لێکۆڵەر، تا لێکۆڵەر دەست بە نووسینی شایەتیەکەی بکات.

٢- پرسیاری ناو و ناسناو و پیشەو شوێنی نیشتەجێبوونی و پەیوەندی بە تۆمەتبارو تاوانلێکراو و سکاڵاکارو داواکاری مافی شارستانی لێدەکرێت، ئایا پلەی ئەم پەیوەندییەی لەگەڵیان چەندە، و تەمەنی چەندە.

٣- شایەت سوێند دەخوات ڕاستی بڵێت بێ زێدە، کەمکردن و سوێندنەخواردن شایەتیەکەی پووچەڵ دەکاتەوە.

٤- دوای سوێندخواردن، لێکۆڵەر لێی دەپرسێت چی زانیاری هەیە لەبارەی کێشەکەو ڕێی دەدات لەخۆڕا باس بکات هەرچۆنی دەیەوێت چی بە دەستەواژەی تایبەتی یا زمانی ڕەمەکی.

٥- لێکۆڵەر قسەی شایەت نابڕێت تا لە قسەکانی دەبێتەوە، چونکە سەری لێ دەشێوێنێت.

٦- لە حاڵەتی ئەوەی شایەت بە ئازادی قسەکانی خۆی دەکات، دەشێ لێکۆڵەر بیریخاتەوە کەوا هەندێ ڕاستی لەبیر چووە یا هەندێ ڕووداو.

٧- دوای ئەوەی لێکۆڵەر قسەکانی شایەتەکە دەنووسێتەوە لە کۆنووسی لێکۆڵینەوە بێ لێ سڕینەوە لە نووسین یا گۆڕینی قسەکان یا لێ زیادکردن شایەت دوای خوێندنەوەی چی بە خۆی یا لێکۆڵەر ئیمزای دەکات.

٨- لێکۆڵەر لەکاتی بیستنی قسەکانی شایەتەکە ئاگاداری گۆڕانکاری شڵەژان و گۆڕانی ڕەنگ و ڕووی شایەت بێت، هاوکات تاوگیری دەروونی و بیاننووسێت لە کۆنووسدا.

٩- گەر شایەت لەو زمانە نەدەگەیشت لێکۆڵینەوەی پێدەکرێت یا کەڕبوو یا لاڵ بوو، دەشێ وەرگێڕی بۆ دابین بکرێت، یا هێمازان و سوێند دەدرێت ڕاستی بڵێت.

## وتوویژ لەگەڵ شایەتەکان

١- پرسیارەکان بەپێی زنجیرەی ڕووداوەکان دادەنرێت: واتە ئەو پرسیارانەی لە شایەتی دەکرێن دەبێ پەیوەندی بە ڕووداوەکەو بابەتەکەی هەبێت بەپێی زنجیرە بەندیی ڕووداوەکەو لە یەکەم ڕووداوەوە دەستپێ دەکات دواتر ڕووداوی دوای دوای پشووێك.

٢- شێوازی لۆجیکی پەیڕەوکردن لە پرسیارکدن: واتە لێکۆڵەر ئاسانترین شێواز هەڵبژێرێت بۆ گەیشتنە ڕاستی لە ئاگاداربوون بەدواداچوون و چاودێری شتە بەرگومانەکان (مشبوە) لەلایەن شایەت و چاودێری ئەو کەسانەی هاتوچۆی شوێنەکە دەکەن و چی پەیوەندیان بە تۆمەتبار هەیە یا تاوانلێکراو، گرنگە لێکۆڵەر نەرم بێت لەگەڵ شایەت و هەڕەشەی لێ نەکات.

٣- ڕوونی و سادەیی پرسیارەکان: پێویستە پرسیارەکان ئاشکراو دیار بن لێڵی و نادیاری تیا نەبێت و ئاسان تێیان بگات.

٤- پرسیارەکان پێگوتن (تلقین)یان تێدا نەبێت: لێکۆڵەر نابێت پرسیارێك لە شایەت بکات، ئاماژە بە جۆرە وەڵامێك بکات یا ئاماژە بێت بۆ وەڵامدانەوە.

٥- پرسیارو وەڵامەکان لە کۆنووسدا تۆمار بکرێت: لە کۆنووس لێکۆڵینەوە، لێکۆڵەر پرسیارو وەڵامەکان دەنووسێتەوەو لەلایەن لایەنەکانی سەرووشەوە دەبیندرێت و دەبێت هیچ پێگوتن (تلقین)ی تێدا نەبێت یا سڕینەوەو ڕاستکردنەوە.

## ئەو ڕێگایانەی لێکۆڵەر دەتوانێت پێیانەوە لە دروستی و ڕاستی شایەتییەکە دڵنیابێتەوە:

١- هۆش (عقل) کردنە ناوبژیوان: لێکۆڵەر دەبێت هۆش ڕەچاو بکات سەبارەت ئەو ڕووداوانەی شایەت باسیان دەکات ئایا دەشێن یا نا یا کاری نەکردەیین.

٢- دابونەریت ڕەچاوکردن: لێکۆڵەر قسەکانی شایەت بە دابونەریت دەگرێت، ئایا ڕێك دەکەون لەگەڵی یا نا.

٣- لێکۆڵینەوە لەلایەنی ڕەفتارو توانای هۆشی شایەت: لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی شایەت لە ڕووی ڕەوشت و هێزی هۆش و ڕەوشی (ئەدەب)، تا دڵنیابێت لە دروستی و ڕاستی شایەتییەکە.

٤- ئەزموومنی هەستەوەر ئەزموونکردن: لێکۆڵەر دەبێت دڵنیابێت لە هەستەوەرەکانی شایەت دەشێ هێزی بینینی کەم بێت یا کەڕ بێت، دەبێت ئەم لایەنانە ئەزموون بکات.

٥- دیارکردنی نەسازی (تناقض) لە شایەتیدانەکە: دەشێ قسەکانی شایەتیدانەکە لێك نەسازو دژی یەك بن، چی لەگەڵ خۆی یا شایەتەکانی دیکە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر درۆ یا بابەتی شیاوی جیاوازی لە هەڵسەنگاندن.

٦- وەك یەکی لە شایەتیدان: ئەم وەك یەکییە لە شایەتیدان و ڕێك بوونی قسەکانی شایەتەکان ژمارەیان هەرچەند بێت چی لە بێژەو دەستەواژەکانیان بەرێکەوت نییەو ڕاستی تێدایە.

٧- پرسیار لە وردەکاری و پاژەکان کردن: پرسیار زۆری لێکۆڵەر لە وردەکاری وا دەکات درۆ یا ڕاستی شایەت دەرکەوێت.

٨- فێڵی ڕەوا بەکارهێنان: لێکۆڵەر بۆی هەیە لەبری تۆمەتبار کەسێك دیکە بێنێت و لە شایەت بپرسێت ئایا ئەمە تۆمەتبارەکەیە یا کەسێکی دیکە.

٩- دووپاتکردنەوەی شایەتی: لێکۆڵەر بۆی هەیە جارێکی دیکە داوای شایەتی لە شایەت بکاتەوە، گەر زانی شایەت شێواوە لە وەڵامەکانیدا.

١٠- ئامۆژگاری کردنی شایەت و هاندانی بۆ ڕاستی وتن: پێویستە لێکۆڵەر شایەت تێبگەیەنێت کەوا تەنیا ڕاستی ئەو ڕزگار دەکات و درۆ هەم زیان بە کەسانی دیکە دەگەیەنێت هەم ناوی خۆی لەکەدار دەکات.

## درۆکردن لە شایەتیدان:

حاڵەتەکانی درۆکردنی شایەت دوانن:

١- درۆ بکات و بزانێت درۆ دەکات واتە درۆزنە.

٢- درۆ بکات بێ ئەوەی بزانێت درۆ دەکات لەو حاڵەتەدا ئەو هەڵە دەکات.

### لێکدانەوەی هەردوو حاڵەت

یەکێك لەو دژوارییانەی ڕووبەڕووی لێکۆڵەر دەبێتەوە ئەوەیە بتوانێت شایەتی ئەو شایەتەی زانیاری درۆ دەدات جیاکاتەوە لەو کەسەی زانیاری ڕاست دەدات، بەڵام لە بنەڕەتدا هەڵەن، بێ ئەوەی مەبەستی چەواشەکردنی لێکۆڵەر بێت، لێکۆڵەر لە بیستنی قسەی شایەتەکان وریا بێت و ئاگادار بێت لە جووڵەو تاوگیری (انفعالات) و بە وردی ڕووداوەکە بزانێت پێش بیستنی شایەتەکان و قسە ناکۆکەکان تۆمار بکات و ئەوەی لە نێوان شایەتەکان لە یەك جیاوازن و گوێیان لێ بگرێت دواتر بەرانبەریان بکاتەوەو شایەتی درۆزن دیار بکات. واتە بەرانبەرکردنی شایەتەکان.

**هۆیەکانی درۆکردن دوانن:**

**یەکەم:** هۆیە کەسییەکان

دووەم: هۆیە بابەتییەکان

**یەکەم: هۆیە کەسییەکان**

أ- **حاڵەتی دەروونی و ڕەوشت و کۆمەڵایەتی شایەت:** ئەم حاڵەتانە گرنگن بۆ هەڵسەنگاندنی قسەکانی شایەت، دەشێ نەخۆش دەروونی هەبێت و کەسی دیکە تاوانبار بکات و خۆی بێ تاوان دابنێت.

ب- **پەیوەندی شایەت بە تۆمەتبار یا تاوانلێکراو:** دەشێ خزمایەتی بێت یا برادەرایەتی و شایەت لابدات لە ڕاستی و لە شایەتییەکەی کەمکاتەوە یا زیاد بکات.

ت- **رك و كینە:** واتە قسەکانی ڕاست نەبن تەنیا بۆ دژایەتی تۆمەتبار وابڵێت.

ث- **زێدەڕۆیی:** هەندێکیان قسە نادروستەکانیان بەرگی دیکەی دەبەر دەکەن پێی دەنازن.

ج- **ترس:** هۆکارێکە بۆ درۆکردن.

ح- **بەدگومانی:** تەنیا بە گومان و هەستی خۆی کەسێك تاوانبار بکات یا بێتاوان.

**دووەم: هۆیە بابەتییەکان:**

أ- **پشتگوێخستن:** تەنیا ئەوەك پێی بڵێن لە ئەرکەکەت پشتگوێت خستووە یا کەموکوڕی هەیە درۆ دەکات.

ب- **بەرپرسیاریەتی تاوانکاری:** لە حاڵەتی ئەوەی هاوبەشی تاوانکار بێت.

ت- بەرپرسیارییەتی ئەدەبی و شارستانی: ئەوەك بەرپرسیاریەتی ناوبانگ یا شارستانی بکەویتە سەر درۆ دەکات.

پ- خراپی ناوبانگ: دەشێ ئەوەك ناوبانگی خراپ بێت درۆ بکات بەتایبەتی ئابڕوویەر.

## هەڵەکان لە شایەتیدان

دەروونزانی دەڵێت زۆربەی شایەتەکان هەڵە دەکەن، هەرچەند نیازپاك بن، بۆیە گرنگ لۆجیکی بیرکردنەوەیەتی، تەنیا خواستی ڕاستی وتن بەس نییە، لەبەرئەوەی هۆکاری دەروونی هەن کاریگەرن لەسەر شایەتی، لێکۆڵەر پشت بەنیازپاکی شایەت نابەستێت، خۆی لە ڕاستی قسەکانی دەکۆڵێتەوە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی شایەت و سەرچاوەی هەڵەکانی، کەواتە هەڵسەنگاندنی شایەت لە ڕێی سروشتی کەسایەتی شایەت و ڕەگەزە واقیعییەکانی ڕووداوەکە، شایەتی تا ڕادەیەکی زۆر شێواندنی ڕاستییە، بەهیچ شێوەیەك ڕووداوەکە بابەتیانە وەك وێنەی فۆتۆگرافی ناگوازیتەوە بەڕاستی و ئەمانەتەوە.

## قۆناخەکانی شایەتیدان:

### یەکەم: پێزانین:

چالاکییێکی هۆشە هەستەکان وەردەگرێت لە ڕێی ئەندامە هەستەوەرەکان، پێنج هەستەوەرەکان، بۆ مێشکیان دەنێرێت و ئەویش لێکیان دەداتەوەو دەیاننناسێتەوە بەپێی شارەزایی پێشوو.

**هۆکارە کاریگەرەکان لە پێزانین خۆیەکی:**

١- پێداویستی ئەندامی: وەك برسی بوون و تینووبوون و خواستی کاری سێکسی.

٢- پێداویستی واز (مزاج): کار لە پێزانینی دەکات بۆ جیهانی دەرەوەی دەورووبەری.

٣- ڕاهاتن و هۆگری: بینینی کەسێك لەنێو کۆمەڵێك نایانناسین وادەکات ئاسان بناسرێت و لەوانی دی جیادەکرێتەوە.

٤- پێکهاتەی بیری تاکەکەس: ڕۆشنبیری تاکەکەس و داب و نەریتن و کاریگەر لە پێزانینی جیهانی دەورووبەر.

٥- پێداویستییەکان: ئەو شتانەن بەهای کۆمەڵایەتیان هەیە کار لەسەر پێزانینی تاکەکەس دەکەن.

٦- سروشپێدان (الایحاء): تەواوکردنی وێنەی هۆشەکی لەسەر بنچینەی نادروست و وڕێنە نەك ڕاستی.

٧- پێزانینی گشتگیر (الادراك الاجمالي): لە بابەتی دەرەکی گەیشتن، بەگشتی نەك پارچەکانی دەشی وڕێنەی و نەسازو لێکدژ بێت.

٨- پێزانینی کەتواری (واقع): لە ئەنجامی کاریگەری وڕێنە (وهم) لەسەر تاکەکەس تەنیا ئەوەی دەیەوێت دەبیستیت و دەبینێت.

## سێیەم: ئامادەکردنەوە یا گێڕانەوەی بیرەوەری:

گرنگترین ئەو هۆکارانەی کاری تێدەکەن:

١- ڕێکوپێکی لۆجیکیانەی بیرەوەری: شایەت باسی ڕووداوێك بکات دروست و لۆجیکی و بەرێزو گونجاو، لەم حاڵەتەدا دەشێ شایەتیەکەی شێواو بێت.

٢- دووری شایەتیەکە لە بواری ڕووداوەکەوە یا بیرهاتنەوەکە: واتە شایەت دەبێت نزیك بێت لە بواری ڕووداوەکە تا یارمەتی بیرهاتنەوەی بدات وردەکارییەکان باس بکات.

**٣- زەبری تاوگیری (الصدمة الانفعالية):**

شێوازی چالاکیی بیرکردنەوەی شایەت، واتە لێکۆڵەر زانیاری باش لەم شایەتییە دەست ناکەوێت.

٤- توانای دەربڕین لەلای شایەت: واتە کرداری بیرکەوتنەوەی زانیاری گرنگ شایەت دەیزانێت.

٥- شێوازی شایەتیدان:

أ- **شێوازی خۆکارانە (تلقائي)**: واتە لێکۆڵەر تێکەڵی قسەکانی شایەت نابێت تا قسەکانی تەواو دەبن.

ب- **شێوازی وەڵامپرسی (الاستجوابي)**: واتە لێکۆڵەر پرسیاری زۆر ئاراستەی شایەت دەکات تا چەندان زانیاری دیاریکراوی دەست بکەویت گرنگن لە ڕووداوەکە.

**هۆیەکانی بەهای شایەتی لای گەوران کەم دەکاتەوە، کەوا شایەت بچووك بێت**

١- منداڵ توانایێکی دیاریکراوی هەیە لە پێزانین و تێبینی و بیرکردنەوە.

٢- منداڵ زۆرجاران ئاماژەکانی هەستە جیاجیاکانی تێکەڵ دەکات.

٣- پێویستە منداڵ تێبگەیەندرێت شایەتی گرنگەو ئەنجامەکانی بۆ باس بکرێت.

٤- شایەتی منداڵ بەپێی کەسایەتی وەڵامگرەکە دەگۆڕێت.

٥- منداڵ توانای خەیاڵکردنی زۆرەو لەگەڵ ڕاستی تێکەڵی دەکات.

٦- منداڵ لە جەستەو هۆشی لاوازە، بۆیە ئاسان دەکەوێتە بەر پێگۆتن (إيحاء) و پێنەگەیشتووە لە تاوگیری.

## شایەتی بەساڵاچووان

کە دەگوترێت پیری منداڵییەکی دووەمە، تا ڕادەیەك ڕاستە، پیری وادەکات مرۆڤ بێهێزو شەکەت بێت نەك هەر جەستە، بەڵکو هەست و هۆشیشی، بەتایبەتی توانای بینین و بیستن، واتە ئەوەی دەبینێت یا دەبیستێت، ڕاستیەکە نییە، بۆیە دووچاری هەڵەی دەکات لە شایەتی دان.

## ڕێسا گشتییەکانی وەرگرتنی شایەتی:

١- شایەتیدان لە شوێنێکی هێمندا بێت تا بتوانیت بیرکاتەوەو ئاگادار بێت.

٢- پێویستە دڵنیابینەوە لەوەی شایەت نەخۆشی هۆشەکی (عقلي) نییە، یا بەرکەوتنی لەسەردا یا ئاڵوودەی مادەی بێهۆشکەر نییە یا زۆر ماندوو نییە.

٣- تاوگیری و سۆزداری شایەتەکان ڕاستی دەگۆڕن.

٤- لە بنەڕەتەوە پێویستە شایەتی خۆکارانە (تلقائي) بێت واتە شایەت چۆنی دەویت با بدوێت و زانیارییەکان بڵێت بێ پرسیارو بڕین یا نارەزایی.

٥- گەر ویسترا وەڵامپرسی لەگەڵ شایەت بکرێتو دەبێ دوای ئەوە بێت کە خۆکارانە شایەتی دابێت.

٦- واباشە شایەتی لە شوێنی ڕووداوەکەدا بدرێت.

٧- پرسیاری پێگۆتن (ایحاء)ی تێدا بێت، واباشە نەکرێت چی بە مەبەست یا بێ مەبەست لەلایەن لێکۆڵەر.

٨- ماوەیەکی زۆر نەبێت لە نێوان شایەتی و پێزانین.

٩- ئەوانەی هۆش کولن دەروون کولن بە تەنیا شایەتیان لێ وەردەگرێت.

١٠- دەبێ شایەت بناسرێت.

١١- لە کۆنووسدا شایەتی خۆکارو وەڵامپرسی دەنووسرێت.

# ڕۆڵی دادگای تایبەتمەند لە هەڵسەنگاندنی شایەدی

شاهێدی لە بابەتە سزاییەکان هەروەک بەڵگە قەناعەت پێهێنەرەکانی تر دەگەڕێتەوە بۆ ویژدانی دادوەر و قەناعەتی بەئاستی بەهێزی ئەوشایەدیە بۆ سەلماندن،تەنانەت یاساش دادوەری سزایی پابەند نەکردوە بەهیچ لەو بەڵگانەی خراوەتە بەردەستی،ئەگەر لەناخەوە یەقین وقەناعەتی تەواوی پێ نەهێنا . بەپێی پرنسیپی (حرية القناعة ) ئازادی قەناعەت هێنان، هەروەک لە مادده ٢١٣ی یاسای بنەماکانی دادگەری سزایی هاتوە .

شایەدی دان بەڵگەیەکی دڵنیایی کەرە کەدادوەر خۆی هەڵی دەسەنگێنێ. بەوپەڕی ئازادی بەو شێوەی کەخۆی دەیبینێ وەئاستی کاریگەری لەڕوداوەکەدا وەهیچ پێچەوانەی ئەو هەست و بار و دۆخە نیە کە کاریگەریەکانی لەسەر شاهێدەکە هەبێ کە وای لێ بکات درۆبکات یان هەڵەبکات، کاتێ شاهێد بزانێ ئاستی بەرپرسیاریەتی چیە لەو شایەدیەی دەیدات .تەماشای باری دەروونی و تەندروستی و پێگەی کۆمەڵایەتی وە ڕادەی هۆش و هەستی شایەدەکە دەکرێ بۆ ڕوداوەکە، بۆنمونە لەبۆچونێکی دادگای پێداچونەوە عێراقی دەڵێ (دەسنیشان کردنی تۆمەتباران لەڕوداوێک کەشەو ڕوی داوە بەهۆیەوە شایەدەکان تۆمەتباران ناتوانن ببینن، بۆیە دەکرێ گومان لەڕاستی شایەدیەکەیان بکرێ و شایەدیەکە ڕەت بکرێتەوە ئەگەر پشت ڕاست نەکرێتەوە بە (قرينه) و بەڵگەیەکی مادی تر، هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ کەهەندێ جار شایەدەکان پەیوەندی هاوڕێتی وخزمایەتی و بەرژەوەندی هەبێ لەگەڵ لایەنێکی ڕوداوەکە، یان باردۆخی

ڕوداوەکەو چۆنیەتی ڕودانی ڕوداوەکەو هەموو شێواز وئەگەرەکانی تر کەیاسا بەدیاری کراوی باسی نەکردون جێی هێشتوە بۆ هەڵسەنگاندنی خودی دادوەر .

دادگای پێداچوونەوەی عێراقی لە بریارێکی دا دەڵێ (کار بە پاشگەزبونەوەی شایەد ناکرێ لەو ووتەیەیەی کەپێشتر لەبەردەم لێکۆڵەری پۆلیس و دادوەری لێکۆڵینەوە داویەتی کاتێ دەیەوێ بێت دوای دوساڵ لەڕوداوەکە شایەدیەکەی بگۆڕێ بۆ ئەوەی تۆمەتبارەکە کە خزمی یان هاوڕێی شایەدەکەیە ڕزگار کات لەسزادان).

دادوەر بۆی هەیە گوفتاری شایەدێک دوبەش و جیاکاتەوە لەیەکتر بەشێکی وەرگرێ کەدڵنیایە لەڕاستیەکەی وبەشەکەی تری وەلانێ، کە گومانی لێی هەیە بەتایبەت لەو حالەتانەی کە مەنتیق دەیسەلمێنێ شایەدەکە ڕاستگۆیە لە بەشێک لە شەیەددانەکەی و لەبەشەکەی تری درۆ دەکات، بۆیە دادوەر لەم کاتانەدا سەربەستە بەپێ نەدانی ڕوون نەکردنەوە لەهۆکاری بەهەند وەرنەگرتنی ئەوبەشەیگ شایەدیەکە، لەبەرئەوەی خۆی تێبینی ئەوەی کردوە لەکاتی گوێ گرتن بۆ شایەدیەکە .

دادوەر بۆی هەیە ووتەی شایەدێکی تری پێ ڕاستربێ کە داویەتی لە کاتی لێکۆڵینەوەی سەرەتایی لەوەی کەلەبەردەم دادگای تایبەتمەند دەیدات یاخود بەپێچەوانەوە، دادوەری دەتوانێ ووتەی شایەدێک لەدژی تۆمەتبارێ وەرگرێ و لەدژی تۆمەتبارێکی تر ڕەتی کاتەوە یان دادوەر بۆی هەیە قەناعەتی لادروست لە ڕاستی ووتەی شایەدەکان سەرەڕای یەکنەگرتنەوەی شێوازی ووتەکانیان، نمونەیەکی تری دادگای پێداچونەوەی عێراقی (ئەو شایەدیانەی ڕاستەوخۆ بەچاو بینراون باس لەکرداری تۆمەتبارەکان دەکات بەسسە بۆ سەلماندنی تێوەگلانیان لەتاوانەکە) .

دادگا دەتوانێ ووتەی شایەدی سەلماندن بەهەندتر و گرنگتر وەربگرێ لەووتەی شاهێدی بەرگری یاخود بەپێچەوانەوە.

دادگا بۆی هەیە بەشێک لە ووتەی شایەدێک کەبۆلایەنێک دراوە وەلاوەنێت،وەهەروەها ووتەی شایەدێکی تر وەربگرێ کە ڕەنگە خزمایەتی و دۆستایەتی یان ناکۆکی و دوژمنایەتی لەگەڵ تۆمەتبار هەبێت پێشتر، وەعیبرەت لەوەرگتن یان وەرنەگرتنی ئەو شایەدیە دەگەڕێتەوە بۆ دروستبوونی تەواوی قەناعەت و یەقینی دادوەرەکە لە ڕاستی و ناڕاستی شایەدیەکە، دادگا ئەگەر تێبینی کرد بەڵگەی سەلماندن و بەرگری یەکسانن،زیاتر ڕەچاوی بەڵگەی بەرگری و بێتاوانیەکە دەکات . کاتێک دادگا تێبینی دەکات شایەدێک توانستی هۆش و بیرکردنەوەی لاوازە وە باسی هەندێ شتی لابەلاو بەدەر لەڕوداوەکە دەکات بەڵام دادگا دڵنیایە لەڕاستگۆیی شایەدیەکەی دادگا شایەدیەکەی قبوڵ دەکات . دادگا بۆی نیە ووتەی تەنها یەک شایەد وەربگرێ ئەگەر پاڵپشت و پشتڕاست نەکرێتەوە بە بنەمایەک و بەڵگەیەکی تری تەواوکەر کەڕاستی ڕووداوەکە بگەینێتە قەناعەتی دادگا، بۆ نمونە ووتەی دادخوازێکی ناکام (صبي)کە پاڵپشتە بە ئاگادارکردنەوەی باوکی کەوا تۆمەتبار هەوڵی داوە کاری بەدڕەوشتی (لواطە) ی لەگەڵ ئەنجام بدات وە بەڕاپۆرتی پزیشکی سەرەتایی پشتڕاست کراوەتەوە و باوکی منداڵە ناکامەکە پۆلیسی بەم شتە ئاگادار کردۆتەوە، لێرەدا ئەم بەڵگەیە بەسسە بۆ سزادان لە تاوانەکانی لەکەدار کردنی ڕەوشت (الجرائم المخله بالاداب).

لەهەندێ جۆری تاوان وەک کوشتن ووتەی تاوان لێکراو لەکاتی سەرەمەرگ (تحت خشیه الموت) بەهەند وەردەگیرێ کەزانیاری دەدات لەسەر ڕوداوەکە، ڕاستە ئەم جۆرە زانیاریە بەڵگەی بنبڕ نین بۆ سەلماندنی تاوانەکە یان ئەو بارو دۆخەی نزیکن لەڕوداوەکە،بەڵکو وەک هەر بەڵگەیەکی تری سزایی دەگەڕێتەوە بۆ تاوتوێ کرن و هەڵسەنگاندنی لەلایەن دادگاوە، بەتایبەتی دادگا لەحاڵەتی وادا

هیچ گومان لەوە ناکات کەسێک لەسەرەمەرگ درۆبات و گوناهێکی وا لەگەڵ خۆی بباتە ژێرگڵ هەرچەندە سوێندیش نەدرابێ بۆ ووتنی ڕاستیەکان .جاری وا هەیە شایەدێک ڕوداوەکە بەچاوی خۆی نابینی بەڵام لەکەسێکی تر گوێی لە ڕوداوەکە بووە کاتێ دێتە بەردەم دادگا شایەدی دەدات بەڵام ئەوکەسەی کە ڕوداوەکەی بۆ گێڕاوەتە لەبەردەم دادگا نکۆڵی دەکات کەوای ووتبێ،کەچی دادگا قەناعەت بەووتەی شایەدەکە دێنێ و بەهەندی وەردەگرێ .

بەهەرحاڵ مەرج نیە دادگا شایەدیەک وەربگرێ کەباس لەهەموو ووردەکاریەکانی ڕداوێک دەکات، بەڵام ڕەنگە ئەم شایەدیە ببێتە سەرەداوێکی سەلماندن و دەرەنجامێکی گونجاو و قبوڵ کراو وە یەکانگیربێت لەگەڵ بارودۆخی ڕوداوەکە و بەڵگەکانی تری خراونەتە بەردەم دادگا، جا لەوکاتە دادگا ڕای خۆی وقسەی خۆی دەبێت لە یەکلایی کردنەوە و هەڵسەنگاندنی گوفتاری شایەدەکان و گەیشتن بە دیاری کردنی ئەو بەڵگانەی کە تێبینی دەکات لەبەرژەوەندی یان دژی تۆمەتبارە، وە هیچ تانە لێدانێک (طعن) وەرناگیرێ کە بۆچی دادگا پشتی بە شایەدیەک بەستوە لەبڕیاردان و چاوپۆشی کردوە لەشایەدی تر،چونکە دادگا سەربەستە لەگوێ ڕانەگرتن و لەوەرنەگرتنی ووتەی هەموو شایەدەکان تاکو ڕاستی بۆ دەرکەوێ لەتاوانەکەو سزادانی تۆمەتبارەکە،وەدادگا پەیوەست نیە بەدیاری کردنی ناوی هەموو شایەدەکان خستنە ڕووی پوختەی شایەدیەکانیان،تەنهابڕیارەکەی دادەڕێژێ لەسەر ئەو بناغە و هۆکارانەی قەنەعەتی لا دروست بوە .

هەڵسەنگاندنی بەهای شایەدی جێ هێلراوە بۆ دادوەر،بەڵام لەهەندێ تەشریعاتی وڵاتان وەک میسر هەندێ شایەدی جیاوازی دیاری کردوە و دادوەری پابەند کردوە بە پەسند کردنی ووتەکانیان و ڕەچاو کردنی ئەم شایەدیە لەهەندێ حالەت لەکاتی بڕیاردان،وەک ووتەی ئەوکەسانەی تایبەتن و تەرخان کراون بە سەندنی

سەرپێچیەکان، وەلەعێراق بەپێی مادده (٢٢١) لەیاسای بنەمای دادگەری سزایی کار دەکرێ بەو کۆنوس و ڕاپۆرت و نوسراوە فەرمیەکانی فەرمانبەری تایبەتمەند ڕێکی دەخات لەکاتی سەرپێچی هاولاتیان وەک (یاسای تەندروستی و هاتوچۆ و ........هتد ) ئەم بەڵگانە ( حجە کافیە ) هەنجەتێکی حاشا هەڵنەگرە بۆ سەلماندن، وەبەشێوەیەکی گشتی دەبێ ئەوە لەبیر نەکرێ کە بۆ ئەوەی شایەدی دان جێی باوەڕ و متمانە بێ لای دادوەری بڕیاردەر،دەبێ دووربێ لە زۆرەملێ و گزی .

دوای ئاگادار کردنەوە بە کۆتایی هێنان بەڕێکارەکانی دادگایی کردنەکە دادگا بڕیاری یەکلاکەرەوەو کۆتایی دەدات لە داوایەکە لەدوای دڵنیابوون و تەواو قەناعەت هێنان بەو بەڵگانەی خراونەتە بەردەستی لەهەر قۆناغێکی لێکۆڵینەو دادگایی کردندا وەک دانپێنان و شایەدی و کۆنوسی لێکۆڵینەو پشکنینە فرمیەکان وراپۆرتی لێزانان و هونەریەکان وەگەلاڵە بوونی تەواوی قەرینە بنبڕیەکان و بەڵگە کاریگەری و یاساییەکانی تر لەلای، وەبڕیارەکان وەک نەریتێک یان بێتاوانی وەیان تاوانبارکردن یاخود بێبەری بوون (عدم المسؤليە) یا ئازادکردن و پوچەڵکردنەوەی ئەو تۆمەتی خراوەتە پاڵی وەک ئەوەی لەبڕگەکانی مادده ١٨٢ی یاسای بنەمای دادگەری (قانون اصول المحاکمات الجزائیە ) هاتوە دەردەچن

# وەڵامپرسیی تۆمەتبار یان پرساندنی تۆمەتبار

**(استجواب المتهم)**



گرنگرتنە لە تۆمەتبارو وتووێژ لەگەڵ کردنە سەبارەت بەرگری لەخۆی لەبارەی تۆمەتەکەو بەراوردکردنی لەگەڵ ئەنجامی لێکۆڵینەوە سەبارەت پلەی بەرپرسیاریەتی یا بێتاوانی.

هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی لە وەڵامپرسی : وەڵامپرسی وەك ڕێکارێکی لێکۆڵینەوەی ئەژمار کردووە، لەسەر دادوەری لێکۆڵینەوە یا لێکۆڵەر وەڵامپرسی بکات لە ماوەی (٢٤) کاتژمێری ئامادەبوونی لەوێ، قسەکانی تۆمەتبار تۆمار دەکات و دەتوانێت چەند جار وەڵامپرسی بکات گەر پێویست بوو و تۆمەتبار دەتوانێت وتووێژ لەگەڵ شایەت بکات سەبارەت شایەتییەکە.

تۆمەتبار سوێند ناخوات: لە مادەی ١٢٦ی یاسای بنجی دادگایی سزایی برگە (١) هاتووە: (تۆمەتبار سوێند نادرێت، مەگەر لە شایەتی داندا بێت لەسەر کەسی دیکەی تۆمەتبار، بۆ ئەوەی سوێند نەبێتە زۆرەکی بۆ دانپێدانان، کە یاسا رێی پێنادات یا بە درۆ سوێند بخوات، کە تاوانەو سزای هەیە).

ئازادیی تۆمەتبار لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان: تۆمەتبار ئازادە لە وەڵامدانەوەو دەتوانێت بێدەنگ بێت، بەڵام دەشێ بەڵگەکان دژی ئەو بن و بێ دەنگیەکەی وادەکات بەڵگەکان دژی بەکاربێن، لە یاسای ئینگلیزیدا، دەبێت لێکۆڵەر بە تۆمەتبار بڵێت دەتوانێت قسە نەکات وەڵامی پرسیارەکان نەداتەوە.

## رێسا گشتییەکانی وەڵامپرسی یان پرساندن

### (قواعد عامة في الاستجواب)

١- لێکۆڵینەوە بە وردی لە رووداوەکانی تاوانەکە: لەبەرئەوەی نەزانینی رووداوێکی سادە یا زانینی نادروستو دەرفەتیك لە دەست دەدات بۆ زانینی راستی، بۆیە لێکۆڵەر دەبێ بارودۆخی رووداوەکە باش شارەزا بێت.

٢- لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی تۆمەتبار لە هەموو رووێکەوە: زانیاری لەبارەی خێزان و ژمارەیان و پێگەی کۆمەڵایەتی و کارو پێشینەی دادگەیی، گەر پێشینەی هەبوو یا پەسند کرابوو، کەس و چەند گیرابوو، ئەوانە یارمەتیدەرن بۆ وەڵامپرسی .

٣- خێرا وەڵامپرسی کردن: هەرچەند زوو وەڵامپرسی تۆمەتبار بکرێت ئامانجی باشتر دەبێتو دەنا هەست بە تاوانی لا کەم دەبێتەوەو سزای لا سووک دەبێت.

# ڕێسا وردەکارییەکانی وەڵامپرسی

**(القواعد التفصيلية في الاستجواب)**

## یەکەم: ڕێساکانی پەیوەست بە لێکۆڵەری وەڵامپرسی دەکات

١- لێکۆڵەر دەبێت لەلایەنی دەروونی و جەستەیی ئامادە بێت بۆ وەڵامپرسی .

٢- لێکۆڵەر دەبێت ئازاو خۆڕاگرو نەرم (مرن) بێت.

٣- پێویستە لێکۆڵەر بە گرنگییەوە گوێڕادێرێت بۆ تۆمەتبار لە وەڵامپرسی دا.

٤- لێکۆڵەر نابێت وا دەرکەوێت مەبەستیەتی دانپێدانان وەرگرێت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بگاتە ڕاستی.

٥- پێویستە لێکۆڵەر ئامرازەکانی نووسین و تۆمارکردن باش بشارێتەوە تۆمەتبار نەیانبینێت.

٦- ئەو وشانە بەکارنەهێنێت کاریگەرنو وەك: بکوژ یا دەستدرێژیکەر.

٧- دەبێ متمانەی تۆمەتبار بەدەست بێنێت بۆ دەسکەوتنی زانیاری سوودمەند بۆ لێکۆڵینەوە.

٨- لێکۆڵەر لە وەڵامپرسی دا پێویستە ئاگای لە گۆڕانکاری ڕووخساری تۆمەتبار بێت.

٩- لێکۆڵەر لە هەڕەشەکردن و توندوتیژی دووربێت لە وەڵامپرسی ، دەشێ تۆمەتبار ناچار بێت دانپێدابنێت تا لە ئازاردان دووربێت.

١٠- گەر فرە تۆمەتبار هەبوون بە نزیکترینیان لە تاوان دەستپێ دەکات و ئەوەی ئاسان زانیاری دەدات.

١١- لێکۆڵەر تاك تاك وەڵامپرسی دەکات، تەنیا لە ڕووبەڕووکردنەوە نەبێت.

## دووەم: شوێنی وەڵامپرسی (مكان الاستجواب)

١- واباشە وەڵامپرسی لە شوێنی ڕووداوەکە بکرێت، تۆمەتبار لە کەشوهەوای تاوان و بارودۆخی دایە.

٢- گەر نەکرا لە شوێنی تاوان وەڵامپرسی بکرێت، تۆمەتبار لە ژوورێکی تایبەتی و کەلوپەلی سادەدا وەڵامپرسی دەکرێت.

٣- لەکاتی وەڵامپرسی ، دەبێ ڕێگا نەدرێت کەسی دیکە بێتە ژوور، تا دەرفەت نەدرێت بە تۆمەتبار بۆ بەلارێدابردنی ڕاستی.

## سێیەم: جۆری ئەو پرسیارانەو چۆنەتی وەڵامپرسی :

١- پێویستە وەڵامپرسی بە حاڵەتی باری کەسی تۆمەتبار دەستپێ بکات.

٢- لە سەرەتای وەڵامپرسی نابێت لێکۆڵەر تۆمەت بداتە پاڵ تۆمەتبار.

٣- پێویستە پرسیارەکان بە ڕیزبەندی مێژوویی ڕووداوەکان بن.

٤- پێویستە وەڵامپرسی سەبارەت بابەتی تاوانەکە بێت بەگشتی.

٥- دەبێت پرسیارەکان کورت و دیارکراو و ئاشکراو نالێڵ بن.

٦- گەر تۆمەتبار بە مەبەستی بێدەنگ بوو نابێت لێکۆڵەر کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەدات.

٧- لێکۆڵەر نابێت پرسیاری پێگۆتن (ایحائی) بکات.

٨- وەڵامپرسی یەکە تۆمارکردن بۆ هەموو تۆمەتبارەکان بە هەموو گرۆکانەوە.

# دانپێدانانی تۆمەتبار

**(اعتراف المتهم)**



واتە تۆمەتبار دانپێدانان بکات بە هەندێ لە ڕووداوەکانی دراونەتە پاڵ ئەو یا هەمووی کە تاوانەکە پێکدێنن، دەشی دانپێدانەکە ڕاست بێت، یا لە ئەنجامی ئازاردان بێت یا بۆ ئەوە بێت لەسەر کەسی دیکە لا ببات.

## شێوەکانی دانپێدانان (شكل الاعتراف)

دانپێدانانی تۆمەتبارو یا: (١) بە نووسین دەبێت، یا (٢) بە زارەکی (شفهي) نووسراو، یا ئەوەتا تۆمەتبار خۆی نووسیویەتی و ئیمزای کردووە، زارەکی دەبێت لەبەردەم دەستەڵاتی لێکۆڵینەوە بێت و دانپێدانانی زارەکی گرنگی و بەهای کەمترە لە نووسراو.

## مەرجەکانی دانپێدانان:

١- دانپێدانەر شیاوی تەواوی هەبێت، خاوەن جیاکاری و پێزانین (تمییز وادراك) بێت، تا لە تۆمەتکە بگات.

٢- دانپێدانانەکە دوور بێت لە توندوتیژی و ئازادانە بێت.

٣- ئاشکراو دیار بێت و بێدەنگی تۆمەتبار هاوگری (قرینة) تاوانبار کردن نییە.

٤- پەیوەست بێت بە ڕووداوە تاوانەکە، بوونی دوژمنداری بەبێ بەڵگە، بۆ سەلماندن ناشێ.

٥- گەر دانپێدانان لەخۆوە نەبوو، ڕێکارەکان دەبێ دروست بن.

## ئەرکەکانی لێکۆڵەر لە دانپێداناندا:

١- پێویستە لێکۆڵەر دانپێدانانی تەواو و بە وردەکاری و بەڵگەی دیکەوە وەرگرێت.

٢- لە تاوانی دزی، چۆنەتی چوونە شوێنەکە، ئامرازەکانی چی بوون لە چی شوێنێك دزی کردووە، چۆن پارێزراو بوو، هاوبەشی هەیە یا نا.

٣- بردنە دادگای تۆمەتبار، تەنیا بە دانپێدانانی ئەو دەشێ فێڵ بێت و دادگە دانپێدانانەکە وەرنەگرێت.

٤- بەڵگەو هاوگری (قرینة)کانی دیکە لەگەڵ دانپێدانەکە لەبەرچاو دەگیرێت.

## دانپێدانانی بە درۆ (الاعتراف الكاذب):

١- بەهۆی خراپ ڕەفتارکردنی ئەوانەی لێکۆڵینەوە دەکەن لەگەڵ تۆمەتبار.

٢- دەشێ بەهۆی بەرژەوەندی خێزان یا خزمایەتی کەسێك تۆمەت لەسەر کەسێکی دیکە لاببات و خۆی تۆمەتبار بکات.

٣- هەندێ درۆ دەکەن وەك شانازی و خۆهەڵکێشان.

٥- دەشێ تۆمەتبار هەموو بەڵگەکان دژی بن و ناچار بێت.

## دانپێدانانی نەخۆشانە (الاعتراف المرضي)

دەشێ نەخۆش دەروونی یا هۆشەکی (عقلي) هەبێت و کاریکاتە سەر هەست و پێزانینی و توانای لە تێگەیشتن لە واقعی دەرەوەو نەتوانێت باش لێکدانەوە.

١- تۆمەتبار دووچاری ورێنەی خەمۆکی (ذهان الاكتئاب) ببێت، واتە خۆ تۆمەتبارکردن و خۆ بە بەرپرس دانا لە مردنی باوکی یا خێزانی یا کەسانی دیکە.

٢- نەخۆش هەیە لەبەرئەوەی پنکە مەرەکەبەك بکەوێتە سەر پەڕاوێك وا دەزانێت ساختە کاری کردووە.

٣- دەشێ ژنی نەخۆش تەنیا لەبەرئەوەی سەرسامە بە پیاوێك وابزانێت ناپاکی کردووە، ئەم جۆرە دانپێدانانە بەهەند وەرناگیرێت.

# نکولیکردنی تۆمەتبار

**(إنكار المتهم)**



**تۆمەتبار لە دوو حاڵەت نکولی دەکات:**

**یەکەم:**

١- لێکۆڵەر لە تۆمەتبار دەپرسێت کاتی تاوانکردن لەکوێ بووە، پێش ئەو و دوای ئەویش.

٢- پرسیاری بەڵگەکانی دەکات و گفتوگۆی لەگەڵ دەکات بۆ گەیشتنە ڕاستی.

٣- پرسیاری ئەوەی لێدەکات بۆ سامانە دزراوەکە لە ماڵی ئەوە، یا برینی هەیە، یا پەنجەمۆری هەیە لە شوێنەکە.

٤- لە وشەکانی تۆمەتبار دەکۆڵێتەوە گەر ناکۆکی تیادا بووە لەگەڵ بەڵگەکان و شایەتەکانی دژی ئەون.

**حاڵەتی دووەم:**

نکولی کردنەکەی بەڵگەی لەگەڵدا بێت یا شایەتی نەرێ کردنی تۆمەت، ئەو حاڵەتەیە تۆمەتبار بەڵگەو هاوبەڵگە-قرینە دێنێتەوە تۆمەت لەخۆی دووردەخاتەوە، بەوەی بڵێت دوژمنایەتیان هەبووە لەگەڵ تاوانبەرانبەرکراو، یا لەگەڵ شایەتێك و ئەو لەکاتی تاوانەکە دوور بووە لە شوێنی تاوانکردن، لێکۆڵەر خێرا دەبێت لێکۆڵینەوە لەو قسانە بکات و گوێ لە شایەتان بگرێت کە بەرگری لە تۆمەتبار دەکەن و رێکاری دیکەش بکات.

# شارەزا و شوێنەوارە تاوانییەکان

(الخبراء و الاثار الجرمية)



## شارەزایان (الخبراء)

شارەزایان رۆڵی گرنگ دەگێڕن لە لێکۆڵینەوەکانی تاوانکاری یارمەتی لێکۆڵەران دەدەن لە دۆزینەوەی لێڵییەکانی تاوان بە ڕێبازی زانستی و هونەری بە لێکۆڵینەوەی شوێنەوارەکان.

**شارەزا (الخبير):**

ئەو کەسەیە خاوەن شارەزایی زانستی و هونەری دیاریکراوە، لە خوێندنی زانستی وەریگرتووە وەك پزیشکی دادو شیکاری کیمیایی و کارکردن لە پیشەیێکدا بووەتە خاوەن هونەرو زانین، وەك دارتاش، ئاسنگەرو، کەسانی دیکەش.

## دەستەکانی تایبەتی شارەزایانی سەر بە پۆلیس یا سەربەخۆ

**(الهيئات الخاصة للخبراء التابعه للشرطة او مستقلة عنها)**

**١- پزیشکە دادییەکان.**

**٢- شارەزایان لە پەنجەمۆرو شوێنەواری پێیەکان.**

**٣- شارەزایان لە چەکی ئاگری.**

**٤- شارەزایان لە شێوازەکانی تاوان.**

**٥- شیکارانی کیمیایی.**

**٦- وێنەگران و ئەوانەی تایبەتمەندن.**

### پێویستە هاوکاری لە نێوان لێکۆڵەرو شارەزای تاوانکاری هەبێت.

لێکۆڵەر دەتوانێت شوێنەوارە ماددییەکان کۆکاتەوە لە شوێنی تاوان و شیکاری بەرایی بۆ بکات، بەلام کاتی زۆری دەوێت، بۆیە دەبێت لێکۆڵەر کاری گەڕان و لێکۆڵینەوە وتوێژ لەگەڵ شایەتەکان و **ئاشکراکردن (کشف)** و پشکنین زیاتر بایەخ پێ بدات، شوێنەوارەکان بۆ شارەزایی تایبەتمەند بەجێ بێڵێت.

### پێویستە لێکۆڵەرو پزیشکی دادی هاوکاری یەك بن:

هاوکاری نێوان پزیشکی دادو لێکۆڵەر گرنگە بۆ ئاشکراکردنی تاوان و هەرچەند هاوکاری زۆرتر بێت ئاسانتر تاوان دەدۆزرێتەوەو تاوانبار ئاشکرا دەبێت و پێچەوانەش دروستە.

## ڕووی جیاوازی لە نێوان شارەزاو شایەت:

١- شایەت باسی ڕووداوێک دەکات پێشتر ڕوویداوە، شارەزا ڕای خۆی دەردەبڕێت لەبارەی ڕووداوەکانی لە بەردەمی ئامادەن لەکاتی ڕاسپاردنی بەرادان.

٢- ژمارەی شایەتەکان ئەوانەن ڕووداوەکانیان بینیوە، شارەزا ژمارەیان بەپێی بارودۆخ دەگۆڕێن.

٣- شایەت لەبەرئەوەی ئاگای لە ڕووداوەکان بووە ئامادەیە، شارەزا لەلایەن لێکۆڵەر یا دادوەر دیاری دەکەرێت.

٤- ئەرکی شایەت هەواڵدانە، شارەزا ڕایەك دەردەبڕێت لەسەر زانست و هونەر بنیات نراوەو نزیك لە دادوەر.

# پشکنینی ترشی ناوکی (DNA)

ئەم بەشە دوو تەوەرە لە خۆدەگرێت، یەکەمیان ڕۆڵی پەنجەمۆری ترشی ناوکی لە پزیشکی داد و تەوەرەی دووەمیش پەنجەمۆری بۆماوەییە.

## تەوەرەی یەکەم: ڕۆڵی پەنجەمۆری ترشکی ناوکی لە پزیشکی داد

بەر لەوەی باس لە DNA بکەین پێویستە سەرەتا لە بارەی خانەی لەشی مرۆڤ بزانین، خانەی مرۆڤ کۆمەڵێك ناوکی ڕاستەقینە پێك دێت، و ئەو خانانەش مادەی بۆماوەیی لە خۆیدا هەڵگرتووە لەسەر شێوەی جەستەیەکی سنوردار و دەوردراو بە بەرگێك، کە پێی دەڵێن بەرگی خانە یاخود پۆشەری پلازما و لە ناوەڕاستی خانەکەش (کە خانە خۆی پێکهاتەیەکی گۆیی هەیە) ناوك هەیە، و ئەو ناوچە سنوردارەی نێوان خانە و بەرگی خانە پێی دەوترێت سایتۆپلازم و لەناو ناوکی خانە مادەی بۆماوەی هەیە پێی دەڵێن ناوکەترشەکان DNA.

و ترشی ناوکی ڕایبۆزی کەم ئۆکسجین (DNA) جۆرێکە لە گەردیلە وردەکانی ترشە ناوکییەکان: "کە بریتییە لە گەردیلەیەکی درێژ تیایدا کۆدی بۆماوەیی تاك بۆ هەر کەسێکی تێدا هەڵگیراوە، و زانیاری دروستکردنی پرۆتینە پێویستەکانی کارکردنی جەستەکان هەڵدەگرێت، و زانیارییەکانی ترشە ناوکییەکان (DNA) لە باوانەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەچەکان، کە وەچەکان هەڵگری نیوەی ترشی ناوکی باوکەکەیە، و نیوەکەی تر هی دایکیەتی.

و لەناو سایتۆپلازمدا چەند دەنکۆڵەیەك هەن پێیان دەڵێن ڕایبۆسۆمەکان و هەر ڕایبۆسۆمێك پێك دێن لە ترشە ناوکی ڕایبۆزی (RNA)[1]. سەرباری پرۆتین لە جەستەی مرۆڤدا ١٠٠ بلیۆن خانە پێك دێت و هەر خانەیەك پێك دێت لە (٤٦) کرۆمۆسۆم و هەر کرۆمۆسۆمێك لە بۆماوەخانە یاخود جینات پێك دێت کە دەگاتە نزیکەی ٣٠٠٠٠ سی هەزار دابەش بوون بەسەر کرۆمۆسۆمەکان و ئەو کرۆمۆسۆمانە لە نێر و مێ پێکهاتوون و ئەوانیش لە دوو ئاوێتەی سەرەکی پێك دێن کە ئەوانیش ترشی ناوکین.

و پزیشکی دادیش بریتییە لەو زانستەی کە نادیار بە دەردەخات لە باسەکانی مردنی ناسروشتی (Un Natural Death) و لەوانە تەکنیکی ترشی ناوکی کە لەسەرەوە باسمان کرد، یەکێك لەو تەکنیکانەی کە هاوکارە لە گۆڕینی نادیار بۆ دیار و ئاشکرا بۆیە بەمەش شۆڕشێکی بەرپا کرد لە پزیشکی داد دا لە هەموو لایەکی جیهان و یارمەتیدەر بوو بۆ پشکنینی دادپەروەری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی زیادکردنی لایەنە پشکنین و دادگەرییەکان بە

---

(١) جیاوازی نێوان DNA و RNA ترشی ناوکی ڕایبۆزی کەم ئۆکسجینە لەسەر شەکری ڕایبۆزی کەم ئۆکسجین (بە ئینگلیزی: Sugar Deoxyribose) لە کاتێکدا ترشی ناوکی ڕایبۆزی (RNA) لەسەر شەکری ڕایبۆزییە (بە ئینگلیزی: Sugar Ribose)، و تاکە جیاوازییان ئەوەیە شەکری ڕایبۆزی کۆمەڵێك هایدرۆکسیدی زیادەی هەیە بە بەراورد بە شەکری ڕایبۆزی کەم ئۆکسجین، کە گەردیلەی هایدرۆجینی هەیە پەیوەستە بە گەردیلەی کاربۆنی دوانەنەڵقەیی. و DNA گەردیلە دووانە شریتییە و لە کاتێکدا RNA گەردیلەیەکی تاك شریتییە، و هەریەکەیان ئەرکی جیاوازییان هەیە لەسەر مرۆڤ، کە DNA بەرپرسیارە لە هەڵگرتن و گواستنەوەی زانیارییە بۆماوەییەکان لە کاتێکدا RNA ڕاستەوخۆ هێمایە بۆ ترشە ئەمینییەکان، هەروەها وەك پەیامبەرێك لە نێوان DNA و ڕایبۆسۆمەکان کار دەکات بۆ دروستکردنی پرۆتینەکان. DNA پێك دێت لە بنکەکانی ئەدینین و ثایمین و سایتۆسین، گوانین، وەك باسمان کرد، بەڵام RNA پێك دێت لە: ئەدینین، یۆراسیل، سایتۆسین، گوانین، و یۆراسیل جیاوازە لەگەڵ ثایمین لە ڕووی نەبوونی کۆمەڵەی مەثیل لە زنجیرەکەیدا.

بەڵگەی زانستی کە وەك هاوکارییەك یان بەڵگەیەکی بڕاوە لە پاکانەی بێتاوان و دانانی تاوانی تاوانبارانی توندوتیژی و کوشتن و دەستدرێژیکردن و هیتر بەکاردێت لە دادگەرییەکانی تاوان و داد لە قەفەزی تۆمەتبارکردندا.

گرنگی تەکنیکی پەنجەمۆری ترشی ناوکی (پەنجەمۆری بۆماوەیی یاخود جینی):

١. بریتییە لەو تەکنیکە ئەندازەیی بۆماوەییەی کە لە دەستنیشانکردنی ناسنامە و جیاکردنەوەی کەسەکان و دۆزینەوەی پەیوەندییە خزمایەتی و نەوەییەکان بەکاردێت.

٢. ماددەی ترشی ناوکی یان دی ئێن ئەی ئەو مادەی بۆماوەییەیە کە لە کرۆماتینەکان پێك دێت لەناویدا هەموو زانیارییە بۆماوەییەکانی بوونەوەرێکی زیندووی لە خۆگرتووە، کە زانیارییەکان بریتین لە ڕوونکراوەی سیفەتە دروستکارییەکانی و ئەو ماددانە بەگوێرەی یاسای مەندڵ بۆ بۆماوەیی ، لە هەریەك لە دوو باوانەکە بۆی ماوەتەوە، و یاسای مەندڵ بۆ بۆماوەیی سێ یاسایە:

أ. وەچەکان بە شێوەیەکی یەکسان ماددە بۆماوەییەکان لە باوان وەردەگرێت.

ب. سیفەتە بۆماوەییەکان لە باوانەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەچەکان بەشێوەی سەربەخۆ لە نێوان هەریەکێکیان.

ج. گواستنەوەی سیفەتە بۆماوەییەکان بە ڕێژەی ناسراو لە نێوان نەوەکاندا جیادەکرێتەوە.

**یەکەم: ڕۆڵی پەنجەمۆری تیشکی ناوکی لە پزیشکی داد:**

١. لێکۆڵینەوە لە ناسنامەی تاوانباران لە کەیسە تاوانییەکان.
٢. لێکۆڵینەوە لە ناسنامەی ونبووان و بێ ناسنامان لە ڕووداوی جیاواز وەك ڕووداوی جەنگ و تەقینەوە و داگیرکردن و کارەساتە سروشتییەکان و ڕووداوی ڕێگاکان وەك کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە و بەریەککەوتنی شەمەندەفەرەکان و نقومبوون و سووتان و دۆزینەوە قوربانیانی تاوانی گۆڕە بە کۆمەڵەکان و هی تر.
٣. لێکۆڵینەوە لە ناسنامە لە کەیسەکان توندوتیژی سێکسی و دەستدرێژیکردن.
٤. پشکنینی کوڕێتی و دەرخستنی گەڕاندنەوە و ڕەچەڵەکی زیندووان و مردووان.
٥. لێکۆڵینەوە لە ناسنامەی زنجیرەیەك لە تاوانی جۆراوجۆر.
٦. چارەسەرکردنی کێشە یاساییەکانی کۆچکردن بۆ وڵاتان.
٧. کێشەکانی هاتوچۆ و ڕووداوەکانی هاتوچۆ و هەڵاتن.
٨. توێژینەوە لە مێژووی بنەچەی نەوەکان و توێژینەوە لە درەختی خانەوادەیی.

## دووەم: گرنگی پەنجەمۆری ترشی ناوکی لە گەڕان بە دوای بەڵگەی تاوانکاری:

١. وردی و هێزی جیاکردنەوەی ڕەها: پەنجەمۆری ترشی ناوکی هەرگیز لە نێوان دوو کەسدا لە کۆی ١٢ ملیار کەسدا دووبارە نابێتەوە ... واتا ئەگەر ژمارەی دانیشتوان بکەی بە دوو هێندە دوو کەس نابینیەوە هەمان پەنجەمۆری بۆماوەیی هەبێت مەگەر دوو کەسەکە دووانە (جمك) بن.

٢. دەشێت ماددەی دی ئێن ئەی دەستەبەر بکەی لە نموونە نوێ و کۆنەکان تەنانەت دەتوانی لە نموونە زۆر کۆنە دوورەکانیش دەستەبەر بکرێت.

٣. دەتوانێ ماددەی دی ئێن ئەی لە هەموو شوێن و بەشەکانی جەستەی مرۆڤ بەدەست بهێنی.

هەر لەبەر ئەمەش چەندین کەیسی بەڕووی خۆیدا کردەوە بۆ پشکنین لێی، دوای ئەوەی لە پێشتردا نادیارەکان سنوردار کرابوون لەبەر نەبوونی ئەم تەکنیکە لەو کاتەدا.

## سێیەم: ئەو نموونانەی دەتوانین لێیەوە مادەی دی ئێن ئەی دەستەبەربكەین:

ناوكی خانەی زیندوو و خانەی مردووش لەمانە هەن:

١. خوێن و پەڵەی خوێن.
٢. پەڵەی شلەی (سپێرم) و ئاوی (زێ).
٣. ڕەگی (موو)، هەروەها ستوونی موویش (مایتۆكۆندریای دی ئێن ئەی) تێدایە.
٤. شانە جیاوازەكانی جەستە.
٥. شلەی ئەمینی و سلیلۆزی.
٦. خانە توێنەرەكان لە شلە زیندەییەكانی جەستەدا (لیكاو، دەرهاویشتراو (میز)، ئارەقە، شلە ناوەخنییەكان، ... هتد)
٧. ئێسك و مۆخی ئێسك بەتایبەت (ئێسكی درێژی جەستە و ددان).
٨. ئەو خانانەی كە بەجێماوە لە دەفر یان قاپ یان جگەرە یان بنێشت یان چەكە جۆراوجۆرەكان، ئەمیش پشت بە سێ هۆكاری سەرەكی دەبەستێت:
أ. هێزی پەستان (وەك هێزی دەست لەسەر دەفرێك)
ب. كات (هەتاوەكو كاتی دەستلێدان لە دەفرێك زیاتر بخایەنێت زیاتر توانای دەستخستنی دی ئێن ئەی مان دەبێت)
ج. بوونی ناوەندێكی گوێزەرەوە بۆ خانەكان و دی ئێن ئەی وەك ئارەقە (ئارەقەی دەست لەكاتی بەركەوتنی بە دەفرەكە).

تێبینی: ناتوانرێت ماددەی دی ئێن ئەی دەستەبەر بكەیت لە فرمێسك و شلە زیندەییەكانی كە خانەی توێنەر نییە لە ناویدا.

# پەنجەمۆرەکان
# (شوێپەنجەکان)

**پەنجەمۆرەکان:** هێڵە شێوەییەکانی بەرچاون بەرز و نزم لە تەکی دایەو لەسەر سەری پەنجەدان و گەر بە هەر ڕووێك کەوتن شوێنەوار جێدێڵن.

## سەرەتای دەرکەوتنی لە جەستەی مرۆڤدا

هێڵە بەرزو نزمەکان لەسەر پێست دەردەکەون لە مانگی چوارەمی تەمەنی کۆرپەلەی ناوسك لە مانگی شەش تەواو دەبن، واتە منداڵ کە لە دایك دەبێت، تەواو ڕسکاون و سوودبەخشن بۆ دیارکردنی کەسایەتی، هێڵە بەرزەکان لووی- غدە نارەقەی تیایە دەریدەدات، لەبەر چەورییەکەی یارمەتیدەرە بۆ چاپ بوونی پەنجەمۆر لەسەر ڕووی شتەکان، لەم دەردراوە ئارەقەییانە کلۆریدی سۆدیۆمی تیایە شوێنەوار لەسەر تەنی مژۆك- ماص، یا وشك بەجێ دێلێت، هێڵە نزمەکان نێوان هێڵە بەرز ەکان دەمارە هەستیان تێدایە بۆ هەست بە شتان کردن.

## تایبەتمەندییەکانی پەنجەمۆر (خواص بصمات)

١- **پەنجەمۆر بە درێژایی ژیان چەسپاوە:** واتە وێنەی هێڵە بەرزەکان و نزمەکان شێوەیان و تایبەتمەندیان دەپارێزن، لە تەمەنی منداڵی و لاوی و پیری، بەڵکو دوای مردنیش تا جەستە شی دەبێتەوەو دەبێتە خۆڵ.

٢- **شیاوی گۆڕان و گۆڕین نییە:** شایانی گۆڕان نییە گەر پێست چی بەسەر بێت جارێکی دیکە دەردەکەوێتەوە لە شوینی خۆی هەتا گەر چینی ناوەوەیش

تێك بچێت، نەخۆش گولی- گورِی دەشێ تێکی بدات، تاوانباران ناتوانن لای ببەت یا شێوەی بگۆڕن.

**٣- پەنجەمۆری دوو کەس لە یەك جیاوازن وەك یەك نین:** هەتا جمکی- دوانەی وەك یەك جیاوازن، لە خاڵ و نیشانەدا.



## جۆرەکانی پەنجەمۆر (انواع بصمات الاصابع)


Right Thumb


Right Index


Right Middle


Right Ring


Right Little


Left Thumb


Left Index


Left Middle


Left Ring


Left Little

## ١- چەماوەکان:

پەنجەمۆری چەماوەیی ئەوەیە هێڵەکانی بەشێوەیێکی ئاسۆیی چەماوە یا کەوانەیی بەرەو سەرەوە لەلایەك بۆ ئەوەی دیکەن، دوو جۆرن:

أ- چەماوە سادەکان: چەماوەییەکەی سادەیە لە ڕەوتی تا کۆتایی دێت لەلایەنی دووەمی بەرانبەر وەك چەماوە دەردەکەوت.

ب- چەماوەکانی ڕەشماڵی، یا بەرز: ئەوانەن هێڵەکانیان لەلایەکی پەنجەمۆر دەبێت دواتر بەرزدەبێتەوە لە ناوەڕاست و دەچەمێتەوە بە توندی و لێژ دەبێتەوە لایەنی بەرانبەر.

## ٢- لێژییەکان: المنحدرات

أ - لێژییە زەندی-ئانیشکییەکان: ئەوانەن هێڵە شێوەییەکانیان بەرەو پەنجە بچووك دەچن.

ب- لێژییە کەوەرەییەکان- الکعبرە: ئەوانەن هێڵە ناوەندییەکانیان و شێوەیان لە دەرچوونیان بەرەو پەنجە گەورە ئاڕاستەن.

## ٣- خڕۆکەییەکان (المستديرات):

پەنجەمۆرێکی لە ناوەڕاستیدا پێچێك هەیە یەك پێچ ئەڵقەیی یا پێچە لپێچ یا هێلکەیی.

## ٤- ئاوێتەکان (المركبات):

ئەو پەنجە مۆرەیە دوو جۆر یا زیاتر لە کەوانەیی و لێژیی و خڕۆکەییەکانی تێدایە.

## ڕێبازی گەڕان بەدوای پەنجەمۆر لە شوێنی تاوان

**(اساليب البحث عن البصمة في مكان الجريمة)**

- لەکاتی گەڕان بەدوای پەنجەمۆر لە شوێنی تاوان پێویستە پلانێك پەیڕەو بکرێت بزاندرێت تاوانکار لە کوێ هاتووەتە شوێنەوەو لەکوێ دەرکەوتووە.
- دواتر بەدوای هەنگاوەکانی دا بچیت زنجیرەو هەموو شتەکان بپشکنی کە لەسەر زەوی پەرت و بڵاون: شووشە، پەڕاوە و ئاگاداربوون تێکەڵ نەبن، بەڵگەی بەرهەستن.
- تەنیا پەنجەمۆر بەڵگە نییە، هەموو شتێك کەسایەتی تاوانبار دیار بکات بەڵگەیە: موو یا پارچەیێك لە جلوبەرگی یا پارچە شووشە یا بۆیەیێك دەیکرێنێ ئەوانە بەڵگەی یەکلایی کەرەوەن گەر سەلما بوو.
- گەر پەنجەمۆر دۆزرایەوە دەبێت لێکۆڵەر دڵنیابێت ئی تاوانکارە، بۆیە پەنجەمۆری هەموو ئەوانەی ئەو شوێنە یا هاموشۆکاران وەردەگیرێت و بەراورد دەکرێت بۆ دڵنیابوون.

### پەنجەمۆرە دیارەکان (البصمات الظاهرة):

ئەم پەنجە مۆرانە لێکۆڵەر دەکرێ بیان بینێت، یا شارەزا، بە چاوی خۆی و بێ ماندووبوون، یا پەنجەمۆری خوێناوی، ئەوانەشیان کەم وا دەبێت ئاشکرا بن زۆرجار خڵتەن (٥٥) سوودیان کەمە بۆ لێکۆڵەر.

### پەنجەمۆرە شاراوەکان (البصمات المخفية)

ئەو پەنجەمۆرانەن بەرچاو نین، ئاسایی لەسەر ڕووی لووسن وەك شووشەو دەفری گڵێنەیی- فخار- و کەرەستەی دارینی لووس.

## چۆنەتی دەرخستنی پەنجەمۆر (الكيفية اظهار البصمات):

پەنجەمرۆە دیارەکان وێنەیان دەگیرێت بە قەوارەی سروشتیان بۆ بەراورد، شاراوەکان، بە هەندێ مادەی کیمیایی وەك تۆز یا شلە بەپێی تەنی پەنجەمۆری لەسەر، لەڕووی ڕەنگی پاودەرەکە (هاڕاوەکە - مسحوق)

## گواستنەوەی پەنجەمۆرەکان (نقل البصمات):

ئەو شتانەی پەنجەمۆریان لەسەرە دەگوازرێنەوە بۆ نووسینگگەی لێکۆڵینەوەی هونەری (التحريات الفنية) (بەشی پەنجەمۆر)، بێ ئەوەی تێکبچن یا مەترسیان لەسەر بێت.

ئەو شتانەی پەنجەمۆریان لەسەرەو دەگوازرێنەوە، دەبێ بگوازرێنەوە ئەوانەی ناگوازرێنەوە وێنەیەکی وەردەگیرێت دوای دەرخستنی بە بەکارهێنانی پاودەرەکە (هاوڕاو) یا تەنیا پەنجەمۆرەکە دەگوازرێتەوە بۆ وێنەگرتنی.

## چۆنەتی گواستنەوەی پەنجەمۆر (کيفية نقل البصمة):

بە هاڕاوێك پەنجەمۆرەکە دەردەخرێت، پارچەیێك (فویل) دێنین، گونجاو بۆ پەنجەمۆرەکە، چینی سیلیولویدی سەرەوەی چینی وەرگر (اللاقطة)ی ژ ێری و بە وردی دەخرێتە سەر پەنجەمۆرەکەو فشاری دەخرێتەسەر بێ جووڵاندن نەوەك پەنجەمۆرەکە تێك بچێت، چینە وەرگرەکە هەڵدەگیرێت.

لایەکی و دواتر لایەکەی دیکەی هەڵدەگیرێت دواتر چینی سیلیولوید دەخرێتەوە شوێنی خۆی و دەنێردرێت بۆ نووسینگەی پەنجەمۆر بۆ وێنەگرتن.

- هێزی بەڵگەی پەنجەمۆر بۆ سەلماندن: بەڵگەیێکی ماددی بنبڕە لە سەلماندن لە دادگای هەموو وڵاتێك لە جیهان، لە عێراق، بەڵگەیە بۆ دادوەری کۆتایی (حكم نهائي) بە ئامادەبوونی شارەزا بۆ شایەتی لەسەر یەکچینی (تطابق)ی پەنجەمۆری تۆمەتبار لەگەڵ ئەوەی شوینی تاوان.

# شوێنپێیەکان

# (آثار الاقدام)

مەبەست شێوەیەتی، کە لەسەر تەنێك جێی دێڵێت کاریگەری لەسەر هەبێت، وەك: لم یا قوڕ یا خۆڵی ورد، کە دەشێ خوێن یا ئاویش نووسابێت بە شوێنەکە.

## یەدەککاریی تاوانبار لە چوونی بۆ شوێنی تاوانکردن:

تاوانبار کە دەچێتە شوێنی تاوانکردن، کە دەچێتە ماڵێك یا ژوورێك یا شوێنێك بۆ تاوانکردن هەر دەبێ بە پێیان بڕوات و شوێنی بەجێ بێڵێت کە ئەو شتانەی پێوەیە بەپێی ئەو وەبوونە، تەنیا ئی تاوانبارن جیا لە کەسانی دیکەی ئەوێ، لە خاوەن ماڵ یا هاموشۆکارانی ئاسایی.

## شوێنی هەبوونی شوێنەواری پێ (محل وجود آثار الاقدام)

١- شوێنەوار لەو ڕێگایانەدا هەیە وەك جادە- شەقام و زەوی دەورووبەری.

٢- شوێنەوار لە هەموو ئەو شوێنانەدا هەیە کە دەشێ تاوانکار پێیدا ڕۆیشتبێت، وەك پەیژە (سلم).

٣- شوێنەواری پێ لە ڕێگەو ڕێچکەکانی دەشێ تاوانبار دوای تاوانەکەی پێیداچووبێت.

## جۆرەکانی شوێنەواری پێیەکان:

١- پەتی- ڕووت- عارية: واتە بێ پێڵاو یا پۆشاکی پێ.

٢- بە پێڵاوەوە- محتذية: واتە یا پێڵاوی پێدا بووە یا گۆرەوی.

شوێنەواری پێکان لە شوێنی ڕووداوەکە یا لە نزیك ئەو شوێنە سوودی دەبێت بۆ مەبەستەکانی لێکۆڵینەوە:

١- نیشانەی ئەولایە دەدات کە تاوانکار لێیەوە هاتۆتە شوێنی ڕووداوەکەو ئەو لایەی مەبەستیەتی بۆی بچێت دوای تاوانکردن.

٢- ژمارەی تاوانکران و ڕۆڵی هەریەکەیان لە تاوانەکە دەردەبڕێت.

٣- هەندێ سیفەت و تایبەتمەندیی خاوەن شوێنەوارەکە پێشان دەدات، وەك:

أ- دروست- ساخ- سلیم:

ب-شەل، یا شەپلەلێداو (اعرج او مشلول)

ت- کوێر- الحور.

ث- سەرخۆش، یا شڵەژاو- سکران او مضطرب.

ج- بچووك یا گەورە.

٤- درێژی بەژنی خاوەن شوێنەوارەکە دیار دەکات.

## هێزی بەڵگەی شوێنەواری پێکان لە سەلماندندا:

شوێنەواری پێیەکان لە بەڵگە ناڕاستەوخۆکان دەژمێردرێت کەوا دڵنیایی دادوەر زیاد دەکات، گەر بەڵگەی دیکە هەبوو پشتگیری کرد، لەبەرئەوەی ئەمەیان ئاسان ساختە دەکرێت، لەبەرئەوە بەڵگەی بنبڕ نییە، بەڵام گەر هەنگاوەکان دیار بوون و تایبەتمەندی و جیاوازییەکان یەك بوون هاوشێوەی پێی تۆمەتبار بوو، وەك پەنجەمۆر وایە.





# شێوازی تاوانکاری

# أسلوب الاجرام

ئەو ڕێگایە لەسەر بنەمای دەست نیشانکردنی تاوانباران ئەکرێت لە شێوازی تاوانکاری کە ئەیگرنەبەر لە کردنی تاوانەکانیان، تاقیکردنەوەکان دەریانخستووە هەر تاوانبارێک شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە لە کردنی تاواندا کارێکی دژوارە ئەگەر بیەوێ بیگۆڕێ لەبەر ئەوەی ئەوە خوێکە بۆ ئەو کە جیایی ئەکاتەوە لە تاوانبارەکانی تر.

هەرچەندە بە هەڵکەوت سەرکەوتن و وەدەست بێنێ لە هەر تاوانێک کە ئەیکات ئەوەندە زیاتر خۆی بەو شێوازە ئەبەستێتەوە کە گرتوویەتیەبەر بۆ کردنی بەو پێیە ئەو شێوازە ئەبێتە شتێکی ئاسایی بناغە داکوتان بۆی ئەگەر ویستی خۆی بە دووربگرێت و بیگۆڕێت وا بیر ئەکاتەوە ئیرادەی زاڵبووە بەسەری خیانەت لە ئیرادەی خۆی ئەکات، بەو شێوەیە شێوازی تاوانکاری ئەکرێت ئەوەش مۆرێکی نەفسیە بۆ تاوانبار.

ئەوەی جێی تێبینی کردنە کەوا سروشتی پێکهاتەی جەستەیی- نەفسی بۆ تاوانبار ڕۆڵێکی گرنگ ئەبینێ لە دیاریکردنی شێوازی تاوانکاری کە دابەش ئەکرێت لە ئەنجامدانی بەو پێیە ئەو شێوازە هەڵئەبژێرێ کە بگونجێ لەگەڵ ئەو پێکهاتەیە.

وە شیکردنەوەی تاوان عیبارەتێکە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بۆ ئەو بەشانەی کە لێی پێکهاتووە ئەکانەن:

- ئامانج (الهدف).

- دەروازە (المدخل).
- ئامراز (الوسيلة).
- مەبەست (الغرض).
- كات (الوقت).
- سیفەت (الصفة).
- چیرۆكی تاوانبار (رواية المجرم).

## هاوكار:

مانای ئەوە یانی خاڵی گەڕان پاشان ئەگەر ئەو تاوانە كرابێت بە هۆی تەنها كەسێک یاخود بە هاوكاری كەسانیتر، تاقیكردنەوەكان ئەویان سەلماندووە لەسەر هێندێک تاوانباران تاوانەكانیان بە تەنیا ئەنجام دەدەن بەڵام لەهەمانكاتیش هاوكار یاخود هاوڕێیان هەیە.

## هۆیەكانی گواستنەوە:

مەبەستی ئەوە چۆنیەتی چوونی تاوانبارە بۆ شوێنی تاوانەكە و وە چۆنیەتی جێهێشتنی ئەو شوێنەیە، وا پێویستە لەسەر بەردەوامی بەكارهێنانی هەموو توانایەک بۆ دڵنیابوون لە ڕێگای گەیشتنی تاوانبار بۆ شوێنی ڕووداوەكە و گەڕانەوەی دوای كردنی تاوانەكە. وەک شوێنەواری ماتۆرسیكل یاخود سەیارە و یاخود وەک شوێنەواری ماتۆڕسیكل یاخود سەیارە و یاخود چاڵەكانی پێیەكانی وڵاغ و ئەوانیتر.

## سیفەتی جیاكەرەوە

زۆر جار تاوانباران هەڵدەستن لە شوینی ڕووداودا بە هێندێ كار یاخود بزاوتنی نائاسایی كە هیچ پەیوەندییەكی نیە بەو كارانەی كە دەكرێت بە كێشانی بەختە

کە دەرنەچێت لەسەر ڕۆحی خۆ هەڵکێشانە کە زاڵە بەسەر هەستی تاوانبار، ئەو کارانەش گرنگی خۆی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە ئەویش زۆرە و هەمە جۆرە وەک ڕاخستنی فەرش و یاخود نووستن یاخود خۆشوشتنی لە گەرماو یاخود ڕیش تاشین یاخود دەم و چاو شوشتن و هەردوو دەست و یاخود جل گۆڕین یاخود نان خواردن و خواردنەوە وە زۆر شتی تر، بۆیە زۆر پێویستە لە نووسینەوەی هەموو ئەو ڕاستیانە لە کاتی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە، ڕەنگە بکرێتە بەڵگەی سەلمێنەر دژی بکەر.



# شوێنەواری چەکی ئاگرین و هاوێژراوەکان

چەکی ئاگرین، ئەو ئامێرەیە ئامادەیە بۆ هاوێژتن، بەکاردێت بۆ تاوانکردن دژی مرۆڤ یا سامان یا بەرگری لە هەردووکیان

١- چەکی شەشخانەکراوی پێچەلپێچ (هەڵکۆڵدراو و لوولپێچ) (الاسلحة المششخنه حلزونيا) (barrel):

ئەو چەکە لە لوولەیەکی شەشخانەکراوی لوولدراوە، و گوللەی بەکارهاتوو لەم چەکەدا لە گوللە، قەوان، باروت، ئەم جۆرە چەکە ئاگرییە دەمانچەو تفەنگ و چەکی گوللە خێراکاندە گرێتەوە.

٢- چەکی شەشخانەکراوی پێچەپێچ نەکراو: ئەم جۆرە لوولەیێکی لووسی هەیە لە ناوە، شەشخانەی هەڵکۆڵدراوی لوول نییە، گوللە بەکارتوو لەم چەکە بە فیشەك ناسراوە، ئەم جۆرە چەکە تەنیا وەك تفەنگ وایە، زۆربەی جاران بۆ ڕاو بەکاردێن، یا پاسەوانی لە هەندێ کێڵگەو بێستان و هەندێکیان یەك لوولەن و هەیە دوو لوولەن، چەکی ئاگرین، یا ئۆتۆماتیکی (ئامێرەکی)ین یا یەك جار پاڵدانی بەرپل (پەلاپیتکە) بەسە بۆ تەقاندن، دوای یەکەم گوللە دووەم و سێیەم بەدوادا دێت تا گوللەکانی گوللەدان تەواو دەبن، جۆری دووەم جۆری نائۆتۆماتیکی، هەر گوللەیەك بە تەنیا دەتەقێندرێت وەك هەندی دەمانچەو تفەنگ، هەندێ چەك هەردوو شێوازی کۆکردۆتەوە، لێکۆڵەر دەبێت شارەزای جۆرە جیاوازەکانی چەك بێت و توانای لە یەك جیاکردنەوەی جۆرەکانی هەبێت و زۆرباش شارەزای چەك بێت.

## - ڕێکارەکانی لێکۆڵەر دەیانگرێتەبەر لەبارەی چەکی ئاگرین و هاوێژراوەکانی:

لەوکاتە هەواڵ دەگات بە لێکۆڵەر لەبارەی ڕووداوێکی تاوانکاری تیایدا چەکی ئاگرین بەکارهاتووە بۆ کوشتن، لێکۆڵەر پێویستە یەکسەرو خێرا بچێتە شوێنی ڕووداوەکەو نیگاردۆزی (مرتسم) ڕووداوەکە بکات و بێ ئەوەی هیچ شتێك لەشوێنی خۆی بجووڵێنێت.

## - ڕێکارەکانی لێکۆڵەر بە پشکنینی چەکە ئاگرینەکان:

کاری لێکۆڵەر لە پکشنینی چەکی ئاگرینی لای تاوانکار، یا هەر شوێنێکی دی تیایدا شاردرابێتەوە ئەم ڕێکارانە پەیڕەو دەکات:

**١- وەسفی چەکەکە، وەك:**

أ- جۆری چەکەکەو ناوی کارگەی دروستکارو ژمارەی کارگە.

ب- باسی تایبەتمەندییەکانی دەکات و چ گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە وەك نیشانە یا بۆیە یا نەخشی سەر چەکەکە.

ت- باسی شوێنەوارەکانی ماوەتەوە بەسەر چەکەکە، وەك پنکی خوێن، یا پەنجەمۆر یا زەیت، یا دۆن- (شمع)، یا خڵتەی دیکەی سەر چەکە دەستبەسەرداگیراوەکە، گەر چەکەکە لەنێو دۆلابێك هەڵگیرابوو لەماڵدا ئەوا شوێنەواری دۆلابەکە لەسەر چەکەکە دەمێنێت.

ث- **پشکنینی لوولە (الماسورة):** دەشێ چینێك لە خۆڵ یا پاشماوەی ژەنگ لەسەر چەکەکە هەبێت واتای وایە لەمێژە تەقەی پێ نەکراوە، وا چاکە هیچ شتێك نەخرێتە لوولەکەوە، لەبەرئەوەی زیان بە پشکنین دەگەیەنێت و نادروست دەبێت.

**دووەم: بەرگکردنی (تغلیف)ی چەکەکەو ناردنی بۆ شارەزا بۆ پشکنین:**

ئەم بەرگ کردنەی چەکەکە بۆ ئەوەیە بە سەلامەتی بگاتە شارەزاکە، بێ ئەوەی دەسکاری بکرێت یا چەند بەشێکی بگۆڕن.

**بەرگ پێگرتنەکە بەمجۆرە دەبێت:**

١- زارکی لوولەکە بە پارچەیێکی پاك لە خام دەگیرێت، توونـد دەبەسترێت بە داوێکی توونـدو مـۆر دەکرێت، نابێـت فلـین بـەکاربێت یـا پارچـەقوماش، لەبەرئەوەی ڕێی هەوا دەگیرێت و دەبێتە هۆی گۆڕانکاری کیمیایی.

٢- کلۆم- تر باس- بە تفەنگەکەوە دەبەسترێت و مۆر دەکرێت، نەوەك بیگۆڕن.

## شـوێنەواری هـاوێژراوە ئاگـرییـەکـان و ڕێـکـارەکـانی لێـکـۆڵـەر لەبارەیانەوە دەیـکـات:

**١-گولە:** لەوکاتەی گوللە لە چەکی ئاگری دەردەچێت: دەکرێ گوللـە (رصاصة) لە جەستەی تاوانلێکراو بدۆزرێتەوە، یا لە شانۆی تاوان، دوای ئەوەی لـە هەندێ حاڵەتدا لە جەستەی تاوانلێکراو دەردەچێت، یا لەنێو تایە، یا مێزی دار لە شوێنی ڕووداوەکە دا هەبێت.

لەوەشەوە دەردەکەوێت ئایا تایبەتمەندییەکانی خۆی پاراستووە وەك: دەرزبردن یا ڕووشـانی وخراپـی لـە لوولەکـە پەیـدابووە، لەبەرئـەوەی تاوانکـار زۆریـەی جـاران هەموو گوللەکانی پشتگوێ دەخات، یـا بـەهۆی کردارەکـە، یـا نەدۆزینـەوەی یـا گوێنـەدان و بـە گرنـگ نـەزانین بـۆ لێکۆڵینـەوە، گـەر گوللـە تێدابوو، ئـەوە نیشانەیە گوللەکە بە بەردێك کەوتووە یا دیوار یا لە جەستەی تاوانبەرانبەرکراودا بـووەو بـەر تـەنێکی ڕەق کـەوتووە لـە جلکـی یـا ئێسـکی دەکـرێ هـاوجۆری (مضاهات) لەنێو شێوازی گوللەکە بە میکرۆسکۆپی ورد لەگەڵ ناوەوە لوولـەی چەکەکە بەراورد بکرێت.

**٢- قـەوان (الظـرف):** لـەکاتی تەقەکردنـدا، گوللـەکە دەردەچێـت بـۆ ئامانجەکـەو قەوانەکە دەکەوێت لە شوێنی بەکارهێنانی چەك، لەبەرئەوە پێویستە بایەخ بدرێت بـە کۆکردنـەوەی قـەوانی بـەتاڵ و لـە بازنـەیێك لـە دە مـەتر زیـاتر نـەبێت لـە دەورووبـەری جێـی تاوانکارییەکـە، لەبەرئـەوەی چـەکی ئـاگرین، وەك دەمانچـە توانای فڕێدانی قەوانی هەیە بۆ دووری پێنج مەتر.

## هۆکارەکانی کار لە قەوان دەکەن لەکاتی هەڵدانی:

**أ- شوێنەواری دەرزیی فیشەك تەقێن.**
**ب- قەوانی بەتاڵ فڕێدان.**
**ج- فشاری باسکی بەتاڵ.**
**ح- کاریگەری قەوانی بەتاڵ لەسەر دیواری دواوەی گوللە دان.**
**خ- شوێنەواری فشار** لەسەر ڕووی قەوانەکە دەردەچێت لە ئەنجامی توونـدی و نایەکسانی دیواری ژوورەکە لە چەك دا.
د- شوێنەواری سەر قەوان لە ئەنجامی خستنیە شوێنی خۆی لە چەکدا.

**هەموو ئەم شوێنەوارانە بە میکرۆسکۆب هاوجۆریان دیار دەکرێت بە بەراورد بە گوللەکە.**

**بارووت:** دەشێ شوێنەواری بارووت دوای تەقەکردن بدۆزرێتەوە لەسەر:
أ- جەستە یا جلوبەرگی تاوانکار.
ب- جەستە یا جلوبەرگی تۆمەتبار.
ت-هەر شتێك لە شوێنی ڕووداوەکە.
ث- ڕەوگەی (سبطانة)ی چەکەکە.

بۆ دۆزینـەوەی پەیوەنـدی نێـوان بـارووت و چـەك کیمیـایی شـی دەکرێنـەوە، بـۆ زانینی پێکهاتەکانی ئایا یەکن یا جیاوازن.

## ڕێکارەکانی لێکۆڵەر لەبارەی دۆزینەوەی ڕاماشتەکان (المقذوفات) (هاوێژراوەکان):

گەر لێکۆڵەر لە شوێنی تاوانکاریدا گوللە یا قەوان یا فیشەکی دۆزییەوە پێویستە ئەم کارانە بکات:

١- تایبەتمەندیی ئەو دۆزراوانەو جۆرو شوێنی دۆزینەوەیان لە کۆنووسی نۆڕینی بنووسێت، دواتر بیخاتە بەرگەوە بۆ ناردنیان بۆ ئەتاقیگە- تاقیگە- بۆ پشکنین، گەر گوللەکان یا قەوانەکان شوێنەواری دیکەی تێدا نەبوو وەك پنکی خوێن یا جێ پەنجە، دەکرێ بە پارچەقوماشێك بەرگ بکرێن بۆ ناردنیان.

٢- زۆر توونـد دەبەسترێن (دۆزراوەکان) و مۆری لێ دەدرێت بە مۆمی سوود و مۆری فەرمانگە.

٣- گەر شوێنەوار لەسەر هاوێژراوەکە هەبوو، پێویستە لە دەفر (علبة)ی وا دابنرێ گوللە یا قەوانەکان جێیان بێتەوە.

دواتر بە داوێکی توونـد دەبەسترێت و کۆتایی گرێیەکە بە مۆمی سوور مۆر دەکرێت.

گەر هاوێژراوەکە (المقذوفات) جێ پەنجەی لەسەر بوو پێویستە شتەکان لەنێو دەفرەکە لە یەك جیاکرێنەوە بەناوبڕی ڕاستۆکی (رأسی) تا بەریەك نەکەون، دواتر لەسەر دەفرەکە دەنووسرێت نابێت (قەدەغەیە) دەستی لێبدرێت.

### ئەو کاروبارانەی دەبێ لێکۆڵەر لەبەرچاویان بگرێت:

أ- بەهیچ جۆرێك نابێت ئەم دۆزراوانە پاك بکرێنەوە یا دەسماڵی پێدا بهێندرێت، بەڵکو پێویستە بخرێنە دەفرێکەوە وەك خۆی چۆن دۆزراوەتەوە ئەوها.

ب- لەگەڵ دۆراوەکان پێویست نووسراوێك بنووسرێت تیا ڕوونبکرێتەوە چی پێویستە لە پشکنیندا بکرێت.

ج- پێویستە نموونەیێك لە مۆری فەرمی بنێردرێت لەگەڵ بەستە (الرزمة) کە بۆ ئەوەی ڕێ لە ساختەکاری بگرن.

## شوێنەواری ئامارەکانی دیکە:

هەندێ ئامێری دیکە هەن یاریدەدەدەن لە تاوان، وەك: مشار، دەرنافیس و تەورو بیورو چەقۆ و بریەند.. هتد. وەك: کردنەوەی پەنجەرەی ماڵێك، یا شکاندنی چەکمەچەکانی نووسینگە.. هتد.

بەکارهێنانی ئەم ئامێرانە هەندێ هێڵی وردو پێچ و لوولدان بەجێ دیلێیت، جگە لە نیشانەکانی و تایبەتمەندییەکانی لەسەر ڕووی تەنی لەخۆی نەرمتر، گەر بەشی کارا لە ئامێرە بخرێتە ژێر میکرۆسکۆب و وێنەکە گەورە بکرێت نیشانەو ئادگاری لە شێوەی بەرزی و چاڵی شێوە جیاجیای تیا دەردەکەوێت کەوا کار لەسەر جەستەی ئەوە دەکەن دژی بەکارهاتووە چی بۆ فشار یا بڕین، لە ڕێی ئەم شوێنەوارانەوە ئامێرەکە دەناسرێت کەوا لە ڕووداوەکە بەکارهاتووە، یا نا، لەبەر ئەمە گرنگی پشکنینی ئەم شوێنەوارانە گرنگە ڕاستەوخۆ دوای نۆڕینیی ڕووداوەکە، نەوەك لابیرێن یا شێوەیان بگۆڕێت لەلایەن کەسێکەوە.

## ڕێکارەکانی لێکۆڵەر دەیکات لەباری دەسکەوتنی شوێنەواری ئامێرەکان:

لەوکاتەی هەوڵێك بە لێکۆڵەر دەگات لەبارەی ڕووداوێك ئەم ئامێرانەی تیا بەکارهاتووە، چی بۆ کردنەوە یا شکاندنی خەزێنەی ئاسنین، یا دەرگەی دار، پێویستە ئەم شوێنەوارە بندەست بخات (تحفظ) بە دەستی خۆی دەستی لێ نادات یا هیچ مادەییێکی لەسەر دانانێت، ڕاستەوخۆ شارەزاییێك بانگ دەکات بۆ پشکنین و کاری خۆی لەسەر دەکات.

لەوکاتەی بە چاوی ئاسایی لە شوێنی ڕووداوەکە شوێنەوار دەدۆزرێتەوە، یا بە چاوە- عدسەی نزیککەرەوە، پێویستە وێنەی فۆتۆگرافی بۆ بگرێت بۆ دەسکەوتنی زۆرترین زانیاری لەبارەی شوێنەوارەکەو پەیوەندی بە دەوروبەرەکەی و جیاوازی لە شتەکانی دیکە، مەبەست لەم وێنەیە سوود لێوەرگرتنیەتی لە حاڵەتی ئەوەی شوێنەوارەکە تێک بچێت لەکاتی گواستنەوەی، دوای ئەوەی وێنەیێکی باش دەگیرێت، هەڵدەگیرێت و دەگوازرێتەوە بۆ تاقیگە (مختبر)، هاوکات دەپارێزرێت لە تێکچوون.

گەر شوێنەوارەکە لەسەر تابلۆیێکی دار بوو، تابلۆکە دەخرێتە نێو لۆکەوە بۆ پاراستنی هێڵەکان و پێچە وردەکان (ثنية)، لە فشارکەوتنە سەر، لەبەرئەوەی فشار دەشێ تێکیان بدات، یا شێوەیان بگۆڕێت، گەر شوێنەوارەکە لەسەر پارچە ئاسنێك بوو، بەر ترس بوو لەوەی ژەنگ هەڵێنێت وا چاکە برێك زەیتی بخرێتە سەر شوێنی شوێنەوارەکە، یا فازلین.



# شوێنەواری پنکی خوێن

## (أثار البقع الدموية)

پنکی خوێن (بقع الدموية) شوێنەوارێکە زۆربەی جاران لە مادەیێکی شل دروست دەبێت لە شوێنی تاوانەکەدا هەیە، یا لەسەر ئەو ئامرازەی لە تاوانەکەدا بەکارهاتووە، دەشێ لەبەر جلوبەرگ یا جەستەی تاوانبەرانبەر کراو یا تۆمەتباردا هەبێت.

## جۆرەکانی:

پنکەکان زۆر جۆرن دەشێ: خوێنی، یا تۆمی، یا لیکی یا زەیتی، یا قوڕی، و پیسایی و میزیی بن، یا شتی دیکە، بی پێی مایە- ماددەی لێی بەجێ ماوەو پنکەکەی دروست کردووە.

## گرنگی پنک:

لە ڕێگەی ئەم پنکانەوە دەی بگەین بە زانینی زۆر کاروباری جیاواز، پەیوەندی هەیە بە تاوان و تاوانکارەوە، بە یەکسانی، زۆرجاران ئەم پنکانە ڕاستی و دروستی دەردەخەن، لەبەرئەوەیە لەسەر لێکۆڵەرە ڕێکارە پێویستەکان بگرێتەبەر بۆ هەڵگرتنەوەی ئەم پنکانەو ناردنیان بۆ شیکردنەوەی ئەتاقیگەیی، بۆ زانینی سروشت و جۆرەکەی.

**پنکی خوێن:** توێژینەوە لە پنکی خوێن جیاوازە بە پێی جۆری تاوان و چۆنەتی ڕوودانی و شوینی ڕوودانی، و بارودۆخی ڕوودانی، بەگشتی لەم شوێنانەی خوارەوە بەدوای پنکی خوێندا دەگەڕێین:

١- **شانۆی تاوان:** پێویستە لێکۆڵەر لێکۆڵینەوەکانی بە تێگەیشتن لە سروشتی ئەو تاوانە دەستپێ بکات کاری لەسەر دەکات و ئەو شوێنانەی دەشێ پنکە خوێنەکانی لەسەر بێت گەر تاوانەکە کوشتن بوو، لەسەر لێکۆڵەرە لە خاڵی یەکەمەوە دەستپێ بکات وەك دەرگای ژوورەکە، بە ئاڕاستەی میلی کاتژمێر تا دەگاتەوە خاڵی سەرەتا لە زەمینەی ژوورەکەو لەسەر کەلوپەلەکان و ڕایەخەکان، گەر تەنی تاوانەکە هەبوو ئەوە دوا شتە دەیپشکنێت، گەر جووڵێندرابوو پێویستە لێکۆڵەر بیگێڕێتەوە شوێنی بەرایی.

دەشێ تاوانکار شوێنەکە پاك بکاتەوە، بەڵام لە زۆر کێشەی تاوانکاری دەرکەوتووە، تاوانبار هەرچەند وریا بێت، هەندێ شوێنەوار بەجێ دێڵێت، پێویستە لێکۆڵەر وردبین بێت و بیاندۆزێتەوە، گەر لە شوێنێك بوو شوورەی نەبوو، وەك بێستان و ڕێی گشتی، بەدوای پنکەکانی خوێن دەگەڕێت لەو شوێنە دەگەڕێت کە مەزندە دەکات تاوانەکەی تیا ڕوویداوە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی پێویستە وێنەی پنکە خوێنییەکان بگرێت بۆ ئەوەی گەر پنکەکان لەکاتی هەڵگرتنیان تێکچوون بزانیت چۆن بووە.

٢- **جلوبەرگی تاوانبەرانبەرکراو:** دەشێ پنکەکان لەسەر جلوبەرگی تاوانبەرانبەرکراودا بن، یا جەستەی، پێویستە لێکۆڵەر بە وردی وەسفیان بکات، شوێن و قەبارەو شێوەیان دیار بکات، ئایا نوێن یا کۆن، لەبەرئەوەی پنکی کۆن ڕەنگی تێرە (غامق)، لێکۆڵەر سەیری جلوبەرگی دەرەوەو ناوەوەی دەکات.

٣- **جلوبەرگی تۆمەتبار:** ئەوەی لەبارەی جلوبەرگی تاوانبەرانبەر کراو وتراوەو چۆنەتی بینین، بە هەمان شێوە سەیری تۆمەتباریش دەکرێت.

٤- **ئامرازی تاوان کردن:** دەشێ خوێن بە ئامرازی تاوانکردنەکەوە نووسابێت، دەمانچە، یا چەقۆ، یا هەر ئامرازێکی دیکە دەشێ ئامرازی جێبەجیکردنی تاوانەکە بێت پێویستە لێکۆڵەر هەموو ڕێکارەکان بگرێتەبەر بۆ پاراستنی پنکە خوێنەکان.

## چۆنەتی پاراستنی پنکە خوێنییەکان:

باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی پنکە خوێنییەکان، دەستبەسەرداگرتنی ئەو شتەیە، کەوا پنکە خوێنییەکانی لەسەرو بەتایبەتی لەو شوێنانەی دەکرێ جیابکرێنەوەو بگوازرێنەوە، تێبینی دەکرێت خوێن لەسەر شتی بۆیەکراو نامێنێت، بەڵام بە کوتاڵ و گەڵا دەنووسێت دەکرێت بەمجۆرە بیانپارێزین:

١- گەر پنکە خوێنەکان کەوتبوونە سەر زەوی و دیوار، بەشیوەیەك جیانەدەکرانەوە، لێرەدا ئامێری کڕاندن (کشط کاشطة) بەکاردێنن و لەسەر کاغەزی سپی دەگوازرێتەوەو دواتر دەخرێتە لوولەی ئەزموونکردن (انبوبة اختبار).

٢- گەر پنکە خوێنەکان لەسەر کوتاڵ- قوماش بوون، بە وریایی لوول دەدرێت و لە کاغەزی زەیتی سپی لوول دەدرێت.

٣- گەر بنکەکان لەسەر گیاو گوڵ بوو، کۆدەکرێنەوەو لە کارتۆنێك دەکرێن.

٤- گەر نەدەکرێ بگوازێتەوە، لێکۆڵەر بوار بۆ شارەزایێك جێدێلێت خۆی بیانگوێزێتەوە.

٥- پنکەکان دەخرێنە دەفرێك و دەپارێزرێت و ناوی شایەتەکان دەنووسرێت و مۆر دەکرێت و کۆنووسی ڕێکهێنان (ضبط)ی بۆ دەکرێت.

٦- لێکۆڵەر لەسەریەتی نموونەی خوێنی تاوانبەرانبەرکراو بنێرێت بۆ تاقیگە (مختبر) و خوێنی تۆمەتباریش بنێرێت بۆ بەراوردکردنی بنکەکان و نموونە نێردراوەکان.

## هۆکارەکانی کاریگەر لەسەر پنکە خوێنییەکان

١- هۆکاری سروشتی: وەك باو باران بەتایبەتی، گەر شوێنی تاوانکردنەکە شورەی نەبوو، ئەوەش پنکەکە تیکدەدات، هەروەها گەرمای ڕۆژگار لە پنکەکەو ڕەنگی دەکات.

٢- هۆکارەکانی ڕووی پنکەکەی لەسەرە: ڕەنگی پنکە خوێن بەپێی ئەو ڕووەی لەسەریەتی دەگۆڕێت، ئەوەی لەسەر دیوار بێت ڕەنگی خێرا ڕەش هەڵدەگەڕێت، یا قاوەیی، لە ئەنجامی بۆیەی سەر دیوار، گەر لەسەر ڕووێکی لووس بوو ڕەق پنکی نوێ ڕەنگی بریقەدار دەبێت.

٣- هۆکاری کات: بە ڕەتبوونی کات ڕەنگی پنکەکە دەگۆڕێت و تیر دەبێت (داکن).

## وەسفی پنکە خوێنییەکان:

پێویستە لێکۆڵەر باسی پنکەکانی خوێنی بکات لە ڕووی شێوەو ڕەنگ و قەبارەو دووری لە کوژراو و شتی دیکە.

هێمای پنکە خوێنییەکان: لێکۆڵەری وریا دەتوانێت لە پنکەکانی خوێن زۆر کاروباری لێ بخوێنێتەوە، وەك:

١- شوێنی تاوان کردن.

٢- بریندار لە بارێکدا بوو کاتی تاوانکردنەکە.

٣- دیارکردنی بارودۆخی تۆمەتبارو ماوەی نێوان ئەو و نێوان تاوانبەرانبەر کراو.

٤- بەرگری و توندوتیژی کراو لە تاوانکردنەکەدا.

٥- پەیوەندی تاوانکار بە تاوانەکە.

## هێزی بەڵگەی پنکەکان لە سەلماندن:

پنکەکان (البقع) لە بەڵگە دۆخییە (ظرفی) ماددییەکانە، واتە (لە بەلگە هاوگرییەکانە- القرائن)، کەوا سەلماندنی پێچەوانەی هەیە، بەڵام هەیە، تا ئەو کاتەی پێچەوانەی دەسەلمێت، واتە نەرێکارە (نفی) و سەلمێن (اثبات) نییە، گەر پنکەکە لە خوینی تۆمەتبار جیاواز بوو، ئەوا پنکەکە تۆمەتەکە لە تۆمەتبار دووردەخاتەوە.





# شوێنەواری ئامرازەکانی گواستنەوە




تۆمەتباران ئامرازەکانی گواستنەوە بەکاردێنن، وەك: ئۆتۆمۆبێل و پایسکیل، لە هاتووچۆیان بۆ شوێنی تاوانەکەو ئەم ئامرازانە شوێنەوار جێدێڵن، گەر زەویەکە قوڕاوی بوو، خاکی ڕەق هیچ شوێنەواری لەسەر بەجێ نامێنێت.

## سوودەکانی شوێنەواری ئامرازی گواستنەوە

١- جۆری ئامرازی گواستنەوە کە دەزاندرێت.

٢- ئاڕاستەی هاتوچۆی ئامرازی گواستنەوەکە، گرنگە لێکۆڵەر بزانێت تاوانبار بەچی ئاڕاستەیەك هاتوچۆی کردووەو پێویستە ئاڕاستەکە دیار بکات، بەتایبەتی گەر زەوی قوڕاوی بوو.

٣- پانی وگرانی ئامرازی گواستنەوەکە

٤- شوێنی وەستانی ئامرازی گواستنەوەکە.

# سەرچاوەکان

سوود لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتووکە.

١. القاضي/عبدالستار ناجي عون: التحقيق الجنائي الأهداف والوسائل، مكتبة السنهوري، بغداد، بيروت، ٢٠٢٢.

٢. عمار مزاحم مهدي، فن التحقيق الجنائي، الطبعة الثانيه، مكتبة الكتاب، ٢٠٢١.

٣. عمار مزاحم مهدي، مبادىء التحقيق الجنائي في الجرائم الألكترونية والمعلوماتية عبر الأنترنيت وسبل معالجتها، مطبعة الكتاب، ٢٠٢٢.

٤. فرات حمود راضي، معين المحقق العدلي، مكتبة الصباح، بغداد، بدون سنه الطبع.

٥. ربيع الزهاوي، التحقيق والجنايات خطوة بخطوة، مكتبه صباح بغداد، ٢٠٢٢.

٦. القاضي جمال محمد مصطفى، التحقيق الاپبات في القانون الجنائي، بغداد، مطبعة الزمان، ٢٠٠٤.

٧. فخري عبدالحسن علي، المرشد العملي للمحقق، بغداد، مطبعة الزمان، ١٩٩٩.

٨. مظفر خالد عبدالرحمن، تاوان لێكۆڵینەوەی تاوانكاری، هەولێر، مكتبة هەولێری یاسایی، ٢٠٢٠.

٩. القاضي/عبدالحسين صباح سيوان، البصمة الوراثية ومدى حجتها في إثبات النسب ونفيه، مكتبة القانونية، ٢٠٢٢.

١٠. القاضي/ نايف عثمان رمضان، البصمة الوراثيه وحجتها في الاثبات ونفيه، هەولێر، مكتبة ياسايي هەولێر، ٢٠٢٢.

# ناوەرۆك

پێشەکی ........................................................................ ٥

**سکاڵا** ........................................................................ ٩
١- بژاردەکانی سکاڵاکار لە بەرەنگاربوونەوەی تاوان ........................ ٩
یەکەم: ڕێگای ئاشتی لە ڕووبەڕووبوونەوەی تاوان........................ ١٣
دووەم: ڕێبازی هۆزگەری- عەشائیری:........................................ ١٤
٢- ئامادەیی سکاڵاکار بۆ سکاڵاکردن: ...................................... ١٩
یەکەم: ئامادەیی دەروونی (الاستعداد النفسي):............................. ٢٠
دووەم: ئامادەیی دارایی (الاستعداد المالي):................................ ٢٤
سێیەم: ئامادەیی یاسایی (الاستعداد القانوني):............................. ٢٥
چوارەم: ئامادەیی کۆمەڵایەتی (الاستعداد الاجتماعي):...................... ٢٦
پێنجەم: باوەڕو متمانە بەخۆبوون و ئازایەتی نواندن:....................... ٢٧
٣- پێناسەی سکاڵای سزایی و نموونەکەی: ................................ ٢٩
یەکەم: پێناسەی سکاڵا: ........................................................ ٣٠
دووەم: نموونەی خوازنامەی (عریضة) سکاڵای سزایی: ..................... ٣١
٤- شوێنی پێشکەشکردنی سکاڵای سزایی: ................................... ٣٢
٥- چ کەسێك مافی داوای سکاڵای سزایی هەیە؟ ............................ ٣٧
٦- حاڵەتەکانی سکاڵا وەرنەگرتن لەلایەن دادوەرەوە:......................... ٣٩
٧- سکاڵا بۆ کێ پێشکەش دەکرێت؟............................................ ٤٢
٨- دادوەری لێکۆڵینەوە (قاضي التحقيق) ..................................... ٤٣

**لێکۆڵینەوە (التحقیق)** ......................................................... ٤٦
پێناسەی لێکۆڵینەوە .............................................................. ٤٦
ئامانجی لێکۆڵینەوە: ............................................................... ٤٧
١- سەلماندنی ڕووداوی تاوان:.................................................. ٤٧
٢- چۆنیەتی تاوانکردن:.......................................................... ٤٧
٣- هۆکاری ڕوودانی تاوانەکە: .................................................. ٤٨

٤- ناسینی تاوانکار:........................................................ ٤٨

**لێکۆڵەر** ........................................................ ٤٩
لێکۆڵەر: ........................................................ ٤٩
تایبەتمەندییەکانی لێکۆڵەر........................................................ ٥٠

**زانیارییەکانی لێکۆڵەر** ........................................................ ٥٤
١- زانینی یاساکان: ........................................................ ٥٤
٢- پزیشکیی داد (ڕموا- شەرعی): ........................................................ ٥٤
٣- شێوازی تاوانکردن: ........................................................ ٥٤
٤- دەروونزانیی تاوانکاری (علم النفس الجنائي): ........................................................ ٥٥
٥- فریاگوزاریی بەرایی (الاسعافات الاولية): ........................................................ ٥٥
٦- ڕۆشنبیریی گشتی: ........................................................ ٥٥
٧- زمانە بیانییەکان و شێوەزارە (لهجة) خۆجێییەکان (محلي): ........................................................ ٥٦
٨- زانیاری گشتی: ........................................................ ٥٦

**بەڵگە سزاییەکان (الادلة الجزائية)** ........................................................ ٥٧
بەشەکانی بەڵگەسزاییەکان (ماددی و بابەتی) ........................................................ ٥٨
١- ماددی: ........................................................ ٥٨
٢- بەڵگە گوزارەیی و کەسییەکان (الادلة المعنوية والشخصية): ........................................................ ٥٩
٣- بەڵگە ڕاستەوخۆکان (الادلة المباشرة): ........................................................ ٥٩

**هەواڵدان** ........................................................ ٦١
چۆنیەتی ڕەفتارکردنی لێکۆڵەر لەکاتی هەواڵداندا........................................................ ٦١
جۆرەکانی هەواڵدەران (أنواع المخبرين) ........................................................ ٦٢

**نۆڕین لە شوێنی ڕووداوەکە** ........................................................ ٦٤
گرنگی نۆڕینی (اهمية الكشف) ........................................................ ٦٥
ڕێسا گشتییەکانی نۆڕینی ........................................................ ٦٥
١- خێرا نۆڕینی بکات: ........................................................ ٦٥
٢- یەدەککارییەکانی نۆڕینی (احتياطيات الكشف): ........................................................ ٦٥
٣- وەسفکردن: ........................................................ ٦٦
٤- ئەنجامگری (الاستنتاج) و بەڵگەهێنانەوە (الاستدلال): ........................................................ ٦٧

**بابەتی نۆڕینی** ........................................ ٦٨
یەکەم: جێگیرکردنی شوێنی ڕوودانی تاوانەکە: .................... ٦٨
١- جێگیرکردنی حاڵەتی شوێنی وێنەگیراو: .................... ٦٨
جێگیرکردنی حاڵەتی شوێنی بێ شوورە: .................... ٦٩
دووەم: جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەر کراو: .................... ٧٠
١- جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەرکراو لەباری مردندا: .................... ٧٠
جێگیرکردنی حاڵەتی تاوانبەرانبەرکراو گەر زیندوو بوو: .................... ٧٠
سێیەم: جێگیرکردنی حاڵەتی تۆمەتبار .................... ٧١
ئەوەی نۆڕینی دەیگەیەنێت: .................... ٧١
نۆڕینیی هێمایی (کشف الدلالة) .................... ٧٣
مەرجەکانی نۆڕین بەهۆی تۆمەتبار: .................... ٧٣
حاڵەتی فرە تۆمەتباران لە یەك ڕووداودا: .................... ٧٤
حاڵەتی فرە شوێنی ڕووداوەکە: .................... ٧٤

**ڕێکخستنی هێلکاری شوێنی ڕووداوە** .................... ٧٥
نیگاردۆزیی هێلکاری (المرتسم المخطط): .................... ٧٥
ڕێسا گشتییەکانی ڕێکخستنی نیگاردۆزی (المرتسم): .................... ٧٥

**دووبارەکردنەوەی پێکهاتەی ڕووداو** .................... ٨١
گەڕانەوەی تاوانبار بۆ شوێنی تاوان .................... ٨١
ناسینەوەی بەهۆی سەگی پۆلیس .................... ٨٢
کاری سەگی پۆلیسی: .................... ٨٣
ئەرکەکانی لێکۆڵەر لە بەکارهێنانی سەگی پۆلیسی: .................... ٨٤

**هەڵکەندنی گۆڕو نۆڕین لەسەر لاشە** .................... ٨٥

**پشکنین- التفتیش** .................... ٨٨
ڕێسا گشتییەکانی پشکنین: .................... ٨٨
١- خێرا چوونە شوینی پشکنینەکە: .................... ٨٨
٢- یەدەککاری پشکنین: .................... ٨٩
٣- ڕیزبەندیی لە پشکنین: .................... ٨٩
٤- وردیی تێبینی کردن: .................... ٩٠
٥- دووبارەکردنەوەی پشکنین: .................... ٩٠

٦- ئەنجامی پشکنین: ........................................ ٩٠
پشکنینی شوێنەکان: ........................................ ٩١

**شایەت و شایەتیدان** ........................................ ٩٢
ڕاسپاردنی شایەت بۆ ئامادەبوون ........................................ ٩٣
ڕیزبەندیی لە گوێگرتن لە شایەتەکان: ........................................ ٩٤
ئەوانەی گوێ لە شایەتییان دەگیرێت ........................................ ٩٤
ڕێسا گشتییەکانی گوێگرتن لە شایەت: ........................................ ٩٤
وتووێژ لەگەڵ شایەتەکان ........................................ ٩٦
ئەو ڕێگایانەی لێکۆڵەر دەتوانێت پێیانەوە لە دروستی و ڕاستی شایەتییەکە دڵنیابێتەوە: ٩٧
درۆکردن لە شایەتیدان: ........................................ ٩٨
هۆیەکانی درۆکردن دوانن: ........................................ ٩٩
هەڵەکان لە شایەتیدان ........................................ ١٠٠
قۆناخەکانی شایەتیدان: ........................................ ١٠١
یەکەم: پێزانین: ........................................ ١٠١
دووەم: پاراستنی بیردان (حفظ الذاكرة): ........................................ ١٠٢
سێیەم: ئامادەکردنەوە یا گێڕانەوەی بیرەوەری: ........................................ ١٠٣
شایەتی بەساڵاچووان ........................................ ١٠٤
ڕێسا گشتییەکانی وەرگرتنی شایەتی: ........................................ ١٠٤

ڕۆڵی دادگای تایبەتمەند لە هەڵسەنگاندنی شایەدی ........................................ ١٠٦

**وەڵامپرسیی تۆمەتبار یان پرساندنی تۆمەتبار** ........................................ ١١١
ڕێسا گشتییەکانی وەڵامپرسی یان پرساندن ........................................ ١١٢
ڕێسا وردەکارییەکانی وەڵامپرسی ........................................ ١١٣
یەکەم: ڕێساکانی پەیوەست بە لێکۆڵەری وەڵامپرسی دەکات ........................................ ١١٣
دووەم: شوێنی وەڵامپرسی (مكان الاستجواب) ........................................ ١١٤
سێیەم: جۆری ئەو پرسیارانەو چۆنەتی وەڵامپرسی : ........................................ ١١٤

**دانپێدانانی تۆمەتبار** ........................................ ١١٥
شێوەکانی دانپێدانان (شكل الاعتراف) ........................................ ١١٥
مەرجەکانی دانپێدانان: ........................................ ١١٦
ئەرکەکانی لێکۆڵەر لە دانپێداناندا: ........................................ ١١٦

دانپێدانانی بە درۆ (الاعتراف الكاذب): ........ ١١٧
دانپێدانانی نەخۆشانە (الاعتراف المرضی) ........ ١١٧

نکولیکردنی تۆمەتبار ........ ١١٨

**شارەزا و شوێنەوارە تاوانییەکان ........ ١٢٠**
شارەزایان (الخبراء) ........ ١٢٠
دەستەکانی تایبەتی شارەزایانی سەر بە پۆلیس یا سەربەخۆ ........ ١٢١
ڕووی جیاوازی لە نێوان شارەزاو شایەت: ........ ١٢٢

**پشکنینی ترشی ناوکی (DNA) ........ ١٢٣**
تەوەرەی یەکەم: ڕۆڵی پەنجەمۆری ترشکی ناوکی لە پزیشکی داد ........ ١٢٣
یەکەم: ڕۆڵی پەنجەمۆری تیشکی ناوکی لە پزیشکی داد: ........ ١٢٦
دووەم: گرنگی پەنجەمۆری ترشی ناوکی لە گەڕان بە دوای بەڵگەی تاوانکاری: ........ ١٢٧
سێیەم: ئەو نموونانەی دەتوانین لێیەوە مادەی دی ئێن ئەی دەستەبەربکەین: ........ ١٢٨

**پەنجەمۆرەکان (شوێنپەنجەکان) ........ ١٢٩**
سەرەتای دەرکەوتنی لە جەستەی مرۆڤدا ........ ١٢٩
تایبەتمەندییەکانی پەنجەمۆر (خواص بصمات) ........ ١٢٩
جۆرەکانی پەنجەمۆر (انواع بصمات الاصابع) ........ ١٣٠
١- چەماوەکان: ........ ١٣١
٢- لێژییەکان: المنحدرات ........ ١٣١
٣- خڕۆکەییەکان (المستديرات): ........ ١٣١
٤- ناوێتەکان (المركبات): ........ ١٣١
ڕێبازی گەڕان بەدوای پەنجەمۆر لە شوێنی تاوان ........ ١٣٢
پەنجەمۆرە دیارەکان (البصمات الظاهرة): ........ ١٣٢
پەنجەمۆرە شاراوەکان (البصمات المخفية) ........ ١٣٢
چۆنەتی دەرخستنی پەنجەمۆر (الكيفية اظهار البصمات): ........ ١٣٣
گواستنەوەی پەنجەمۆرەکان (نقل البصمات): ........ ١٣٣
چۆنەتی گواستنەوەی پەنجەمۆر (كيفية نقل البصمة): ........ ١٣٣

**شوێنپێیەکان ........ ١٣٤**
یەدەککاریی تاوانبار لە چوونی بۆ شوێنی تاوانکردن: ........ ١٣٤
شوێنی هەبوونی شوێنەواری پێ (محل وجود آثار الاقدام) ........ ١٣٤

جۆرەكانی شوێنەواری پێیەكان: ..... ١٣٥
هێزی بەڵگەی شوێنەواری پێكان لە سەلماندندا: ..... ١٣٦

**شێوازی تاوانكاری** ..... ١٣٧
هاوكار: ..... ١٣٨
هۆیەكانی گواستنەوە: ..... ١٣٨
سیفەتی جیاكەرەوە ..... ١٣٨

**شوێنەواری چەكی ئاگرین و هاوێژراوەكان** ..... ١٤٠
- ڕێكارەكانی لێكۆڵەر دەیانگرێتەبەر لەبارەی چەكی ئاگرین و هاوێژراوەكانی: ..... ١٤١
- ڕێكارەكانی لێكۆڵەر بە پشكنینی چەكە ئاگرینەكان: ..... ١٤١
شوێنەواری هاوێژراوە ئاگرییەكان و ڕێكارەكانی لێكۆڵەر لەبارەیانەوە دەیكات: ..... ١٤٢
هۆكارەكانی كار لە قەوان دەكەن لەكاتی هەڵدانی: ..... ١٤٣
ڕێكارەكانی لێكۆڵەر لەبارەی دۆزینەوەی ڕاماشتەكان (المقذوفات) (هاوێژراوەكان): ..... ١٤٤
ئەو كاروبارانەی دەبێ لێكۆڵەر لەبەرچاویان بگرێت: ..... ١٤٤
شوێنەواری ئامارەكانی دیكە: ..... ١٤٥
ڕێكارەكانی لێكۆڵەر دەیكات لەباری دەسكەوتنی شوێنەواری ئامێرەكان: ..... ١٤٥

**شوێنەواری پنكی خوێن** ..... ١٤٧
جۆرەكانی: ..... ١٤٧
گرنگی پنك: ..... ١٤٧
چۆنەتی پاراستنی پنكە خوێنییەكان: ..... ١٤٩
هۆكارەكانی كاریگەر لەسەر پنكە خوێنییەكان ..... ١٥٠
وەسفی پنكە خوێنییەكان: ..... ١٥٠
هێزی بەڵگەی پنكەكان لە سەلماندن: ..... ١٥١

**شوێنەواری ئامرازەكانی گواستنەوە** ..... ١٥٢
سوودەكانی شوێنەواری ئامرازی گواستنەوە ..... ١٥٢

سەرچاوەكان ..... ١٥٣

ناوەرۆك ..... ١٥٥



شاکر سلێمان محمود

دکتۆرا لەیاسای گشتی- بەشی سزای تاوانکاری

- ١٩٧٠/٧/١- لە گوندی پڵینگە- ناحیەی قوشتەپە لە هەولێر لەدایکبووە.
- ١٩٩٣ پەیمانگای تەکنیکی بەشی کارگێڕی یاسایی تەواوکردوە.
- ١٩٩٧ کۆلێجی یاسای زانکۆی سەلاحەدینی تەواوکردوە.
- ١٩٩٧/٨/٤ تاکو ١٩٩٨/٢/٢٠ کاری پارێزەرایەتی کردوە.
- ١٩٩٨/٢/٢٨ لە سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچونەوەی ناوچەی هەولێر بە لێکۆڵەری دادی دامەزراوە.
- ٢٠٠٨ بڕوانامەی ماستەری لە یاسایی گشتی - بەشی یاسای تاوانکاری بەپلەی زۆرباشەی باڵا لە زانکۆی کۆیە بەدەست هێناوە.
- ٢٠١٥ بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسای گشتی- بەشی یاسای تاوانکاری لە وڵاتی میسر- زانکۆی ئەسکەندەرییە بەپلەی زۆرباشەی باڵا بەدەست هێناوە.



لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تەبایی
هەولێر - قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
07507026021

